# نووسەری کورد

گۆڤاری یەکێتیی نووسەرانی کورد

ژمـــارە (٩) ، خولی دووەم ، تشرینی دووەمی ١٩٨٢



بارەگای گۆڤار

بغـداد ـ الوزيريـة

مقـابل كلية التربية الرياضيـة ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

چاپخانەی «الحوادث»

# ئەم ژمارەیەی تریش ...

ژیانت دوو ساڵ زیاتر لەنێوان مانو نەماندا بیت ، بەڵام هەر لەسەر هەناسەدانو دوواندنو بەرهەمبەخشین بەردەوام بیت ، چونکە هـــەر ژیاوی ، لەبەرئەوە ناتەوێ خۆت گیانبدەیت بەدەستەوەو ئاڵای مەرگ هەڵبڕیتو لەکاربکەویت ، یا بڵێین خۆت گۆڕ بۆ خۆت هەڵکەنیتو گڵ بکەیت بەسەر خۆتدا • لە لایەکی تریشەوە ، چونکە نامێنی ، یا یاسایەك جەنگی مەرگەکەت پیشاندەداتو لەو دوو ساڵ زیاترەدا ، هەمیشە ئەمڕۆ یا سبەینێ دەکات بەوادەو کاتی ، لەبەرئەوە لەپاڵ ئەو دیاردەی ژیان نوواندنەدا ، تینی بیر لە ژیانو گۆڕینو بەرەوپێش چوونت نییە •

ئەمە حاڵی ئەم دوو ساڵ زیاترەی یەکێتیی نووسەرانی کوردە • کە ئەم چەند دێرە دەنووسم هیچ لەوە نەگۆڕاوە کە لە سێ ژمارەکەی پێشوودا باسمانکرد ، هەر لەنێوان مانو نەمانـدایـن • دیمـەنی ژیانمـان مانەوەی بارەگا ، نابارەگا کڵۆڵەکەی دەستەی بەرێوەبەرمانە لە بەغـداو بارەگا لە بارەگا نەچووەکانی لقەکانی سلێمانـیو هەولـێرو دهـۆکە • بەشداریمانە بەتەواویو بە نیوەچڵ لەم مەهرەجانو ئەو دیداری دەسـگا کوردییەکانی سەر بە میریدا ، یەکتر دیتنو لە حاڵی خۆ دوانمانـە • بەڵام نەبوونو ڕاگرتنی کۆڕو میهرەجانی ئەدەبیی خۆکردیشە ••

دیارترین دیمەنـی هەناسەو ژیانمـان ئـەم ژمارانـەی نووسەری

کوردە ، کە دەست دەدەینە هەر ژمارەیە وادەزانین ، دەبێ ووشەی مالئاوایی ووشەی سەرەتاو کۆتایی بێت ، بەلام هێشتا هەر بەبەریەوە دەمێنیو کەلکی هەناسەیەکی‌تر ، ژمارەیەکی‌ترمان دەمێنێ • کەواتە با بەردەوام بین ، چونکە لە بارو حالی بێ‌پارەیی یەکێتیی نووسەرانی کورددا ، کە چەند مانگە تەنانەت توانای ئەوەشمان نەما کرێی ئیشکەرو پاك‌کەرەوەی بارەگاش بدەین ، لەم‌حالەدا دەروویەکی بچووك لە لقەکانمان کرایەوە ، بەوەی ئەمینداریتیی رۆشنبیری‌و لاوان باربۆیەکی سێ لقەکەمانی کرد ، ئەوانیش - یا بلێین پێشتر لقی هەولێرو ئەوسا سلیمانی کەوتنە کۆکردنەوەی کەرەسەی ژمارەی « نووسەری کورد »و ئەرکی چاپکردن گرتنە ئەستۆی • ئەمەش چیرۆکی ئەم ژمارەیەو ئەو ژمارەیەی‌تریش کە یەکسەر دەیخەینە ژێر چاپ •

جارێکی‌تر ئەوەش دووبارە دەکەینەوە کە تائێستا « نووسەری کورد » ، ئەگەر هەموو ژمارەکانیشی بفرۆشرێ ، هەر زیانی لی دەکەین • بەلام دیارە ئێمە ئەو زیانەمان زۆر لا بچووکە ، چونکە تائێستا شانازی بەوەوە دەکەین کە گۆڤارەکەمان وەك ئاوێنەی بێگەردی دەروونی گەل ، لە رێی هەست‌و هەژان‌و بەرهەمی نووسەرانەوە دەچێتەوە ناو خەلك • شانازی بەوەوە دەکەین کە قوتابی‌و کرێکارو تەنانەت فەللاحی کوردیش خۆیان بە خوێنەرو یاریدەدەی گۆڤارەکەمان‌و یەکێتی‌یەکەمان دەزانن • ئەگەر رۆژێك بێت تۆماری رێرەوی ئەم سالانەی ئەم یەکێتی‌یە بکەین ، کە بەراستی بە یەکێتیی نووسەرانی کوردی دەزانین ، ئەوا لە خەرمانی شەرەف‌و یادگاردا شوێن پەنجەی یاریدەی ئەو قوتابی‌و کرێکارو فەللاحانە دەبینین ، ئاریکاریی نیوان نووسەرانی خۆمان‌و هەندێ بیررووناکی مەرد دەبینین • ئەوەش باش

**پاشماوەکەی لە لاپەڕە ( ٨٢ ) دایە**

# سەر هەڵدانی شیعری سیاسیی کوردی
# لە نێوانی خانیو حاجی قادری کۆیی‌دا

نووسینی : کەریم شارەزا

**سەرەتا :**

لەگەڵ سەرهەڵدانی هەر نەتەوەیەكو پەیدابوونی خاسبەتە سەرەکی‌یەکانی بوونو ژیانیدا ، جۆرە هەستێکی ناسكو پڕسۆز بەرامبەر بە خۆشەویستی نەتەوەو ، نیشتمانەکەی لە مێشكو بیری رۆڵەکانی کۆمەڵگای ئەو نەتەوەیەدا پەیدا دەبێ •

ئەگەر ئەو هەستە لەناو کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بێ‌هێزیش بێ ئەوا لەگەڵ سەرهەڵدانی پێشەنگی چینی ناوەنجی ( بۆرژوازی ) جۆش دەسێنێو ئاشکراتر خۆی دەنوێنێو ، دەستەی شاعیرانیش وەك پێشرەوی کاروانی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵگایەی ، لە ریزی پێشەوەی کاروانی نەتەوە دەوەستێو شیعرەکانیان دەبن بە خۆراکێکی گیانی بۆ ژیانو مانو بەردەوام بوونی لەسەر پێشکەوتنی لە رێبازی کاروانی شارستانێتی گەلاندا •

ئەگەر لە سەدەکانی پێشوودا شیعری سیاسی لە چوارچێوەی

شانازی کردن بە ئازایەتی رۆڵەکانی نەتەوەوە دەسووڕایەوە ، دەبینین لە دوا دوای سەدەی رابوردووو ، سەرەتای ئەم سەدەیەماندا خۆی لە دەورەی خەباتی شۆڕشگێڕیی‌و نەخشەکێشان بۆ رێگەی رزگاریی نیشتمان‌و نەتەوە لە چنگی دوژمن‌و یەکگرتنەوەی بەشەکانی ئاڵاندووەو(١) هەوڵی بۆ بەختیاریی چین‌و توێژە زەحمەتکێشەکان بە پێی قۆناغی پێشکەوتنی ئەو نەتەوەیە داوەو ، بووە بە بەرنامەیەکی سیاسی بۆ گۆڕانی ژیان‌و گوزەرانی رۆڵەکانی نەتەوەکەی •

ئەگەر بمانەوێ سەرەتایێك بۆ سەرهەڵدانی شیعری سیاسی لە ئەدەبی کوردیدا دەست‌نیشان بکەین ، ئەوا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سەردەمی شیعری نووسراوەی کوردی ، چونکە کرداری شیعردانان بە زمانی کوردی‌و نووسینەوەی ، سەرەتایێکە بۆ سەرهەڵدانی شیعری نەتەوەیی کورد بەڵکوو تەنیا کرداری دەست هەڵگرتن لە شیعردانان بە زمانی بێگانەو رووکردنەوەی شاعیری کورد بۆ مەیدانی زمانی نەتەوەکەی خۆی‌و ئەدەبی میللەتەکەی ، خۆی لە خۆی‌دا هەنگاوێکی گەورە بوو هاویشتراو ، پێویستە نرخ‌و بەهایێکی گرنگی بۆ دابنرێ •

دەست نیشان کردنی سەردەمی سەرهەڵدانی ئەدەبی نووسراوەی کوردی جێگەی مشت‌و مڕو کێشمەی جیاوازیی بیرو ڕای ئەدەب شناسانی کوردە • لەو کاتەی هەندێ لەوانە دەڵێن : « باباتاهیری عوریانی هەمەدانی ٩٣٥ ـ ١٠١٠ ز » کە شیعرەکانی بە لوڕی داناوە ، بە سەرەتای ئەو هەنگاوی قۆناغە دادەنرێ ، دەبینین هەندێ لە رەخنەگران ، ئەدەبی نووسراوەی کوردی بە شێوەی ( گۆران )و شیعرەکانی مەلا پەرێشان کە لە ساڵی [ ١٣٩٨/١٣٩٩ز] لە دایك بووە بەو سەرەتایە دادەنێن (٢)•

بەڵام ئەگەر بمانەوێ رەگی شیعری نەتەوەیی‌و سیاسی بە ڕوون‌و

ئاشکرایی لە ئەدەبی کوردیدا دەستنیشان بکەین ، ئەوا دەتوانین لـە ئەدەبی کوردیی دیالێکتی کرمانـجی سەروو ، بە تایبەتی لەبەشـە دیالێکتەکەی ( بۆتان ) دا ، لە ناو شیعرەکانی [مەلای جزیری] دا دەست نیشانی بکەین ، لەو کـاتەی کـە لە تێکەڵاوکـردنی زاراوە فارسیو عەرەبیەکان بەکارهێنانی ڕەوانبێـژیی ئەدەبی ڕۆژهـەڵات بە شێوەیێکی گشتی سەرکەوتو داوای لە نەتەوەکەی دەکرد بۆ گرتنە باوەشی شیعرە نایابەکانی خۆیانو ، زمانە نەتەوەیەکەیان لە جیاتی شیعرەکانی سەعدی شیرازی کە لە ساڵی ( ١٢٩١ز ) دا مردووەو ، غەزەلەکانی حـافزی شیرازی [١٣٢٠-١٣٨٩ز] کە ئەو کات شیعری ئەو دوو شاعیرە فارسیە لەناو خوێندەواری کورد زۆر بڵاوبوون(٣) ، هەروەك دەڵێ :ـ

**گەر لوئلوئی مەنثور ژ نەظمی تو دخوازی**

**وەر شیعری مە لێ بین تە ب شیراز چ حاجەت (٤)**

نویشکی مانای شیعرەکەش ئەمەیە : « ئەگەر تۆ مرواری شـیعرت دەوێ وەرە سەیرێکی شیعری (مەلا) بکەو چ پیویستیت بە شـیرازە ؟ » شیرازیش شاری سەعدیو حافزە ؛ مەبەستی مەلای جزیری دوو بەش ئەوە بووە لە کورد بگەیێنێو پێیان بڵێ: « تا شیعری کـوردی خۆماڵی خۆتان هەبێ چ پێویست دەکا خوو بدەنە شیعری بێگانە ؟! » .

ئەوەی شیاوی باسە ئـەوەیە : مەلای جـزیری یەکەم شـاعیری کوردە دیوانێکی تەواوی شیعریی لە دوای خۆی جێهێشتبێو هەمـوو خاسیەتەکانی دیوانی شاعیرە ڕۆژهەڵاتیەکانی لێ هاتبێتە دی ،چ لە بارەی هێنانەوەی سەروای شیعرەکانی لە هەموو بیتەکانی هیجاو چ لـە بارەی بەکارهێنانی بەحرەکانی عەرووزو بەکارهێنانی هەموو جۆرە هونەرێکی

ڕەوانبێژیی عەرەبیو فارسی(٥) ٠ سەرهەڵدانی قوتابخانەیێکی نوێی شیعری کوردی لە ( جزیرەی بۆتان ) دا نیشانەیێکی تری ڕاپەڕینێکی سیاسیو ئابووریو شارستانێتی ئەو هەرێمە بووە لە سەدەکانی شانزدەهەمو حەڤدەهەمداو ( مەلای جزیری ) ئەمەی بە قووڵی لە ئامۆژگاریو هیواو ئاواتەکانی بۆ میرەکانی (جزیرە) دەربڕیوە ، ئەمەش بەشێك بووە لە هیواو ئاواتی گەلەکەی بۆ یارمەتی دانی یەکتر لەناو خۆیاندا بۆ پاراستنی دانیشتوانی میرنشینییەکەیان لە دەست فارسو تورکەکان ٠

جزیری ئەو ئاواتەی بە زمانی شیعر دەربڕیوە ، ووشەو شیعرەکانی کردوون بە باڵی ئەو یەکێتییەی کە لە بۆتانەوە بەرەو هەموو کوردستان دەکشاو(٦) ، زۆر بە ئاشکرایی دەنگی خۆشەویستیو دڵسۆزیی بۆ کوردستانەکەی دەردەبڕێو خۆی دەکات بە گوڵێك لە باغچەی ئیرەمی ( بۆتان )و بەشەوچرای ڕووناکی شەوی تاریکی کوردستانو دەڵێ :ـ

**گولی باغی ئیرەمی بوهتانم**

**شەبچراغی شەبی کوردستانم (٧)**

ئەو چڵەپۆپەی کە مەلای جزیری پێی گەیشت ، بوو بە سەرەتایەکی پتەو بۆ تێکەڵاوبوونی دەنگی کوردی ناو چیاکان بەو دەنگانەی کە لە چیاو دۆڵەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بەرز دەبوونەوەو چوارچێوەی شارستانیەتیان لە فۆرمی شیعری ڕۆژهەڵاتیدا بۆ خۆیان دەدۆزیەوە(٨) ٠

مەلای جزیری شان بە شانی عەلی حەریریو فەقێ تەیران کە هەرسێکیان لەدوایی سەدەی شانزدەهەمو سەرەتاو نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا ژیاون (٩) ئەم سێ شاعیرە کوردە وێنەیەکی

راستگۆی سـەردەمی خـۆیان بۆ بـەجێ هێشـتووین‌و بوون بـە ڕێخۆشکەری پەیدا بووتی شاعیرێکی گەورەی وەکوو خانی [١٦٥٠- ١٧٠٦ ] کە ئەویش توانی گۆڕانکاری‌یەکی تەواو لە ناوەڕۆك‌و فۆڕمی شیعری قوتابخانەی ( جزیره ) بکات‌و بە پێی سەردەم بەرەو پێشەوەی ببات(١٠) •

**ئەحمەدی خانی‌و مەسەلەی نەتەوایەتی کورد :**

مەسەلەی نەتەوایەتی‌و هیواو ئاواتەکانی کورد بۆ رزگاربوون لە لە چنگ ژێردەستی عوسمانلی‌و فارسەکان ، تەنیا خەون‌و ئاواتی شاعیرێك نەبوو ، بەلکوو تێڕوانینێکی زانستیانە بوو بۆ مەسەلەکە بە جۆرێکی وا لەگەڵ واقیع‌و سەردەمدا بە باشی بگونجێ‌و ئەم هەڵوێستەی ( خانی )یش لە بیرو باوەڕێکی پێشڕەوانەیەوە هەڵقوڵا بوو (١١) •

دەبی ئێمە ئەوەش لە بیر نەکەین کە لە سەردەمی ( خانی ) بـە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی دەرەبەگایەتی باڵی بە سەر هەموو لایـەکی کوردستاندا کێشابوو(١٢)، بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ لە نووسەرانمان کە لە ناکۆکی نێوانی میرنشینی‌یە کوردی‌یەکانەوە دەدوێن ، هۆی ئەو ناکۆکی‌و شەڕی ناوخۆیی‌یە « دەگـەڕێننەوە بۆ سـەرهەڵدانی پێشەنگی بۆرژوایەتی کورد لە کوردستان‌و هەوڵدانی ئەو دەستە نوێ‌یەی کۆمەڵ بۆ فراوان کردنی قەبارەی دەستەڵاتی خۆی »(١٣) •

هەروەکوو ئاشکرایەو بە پێی تیئۆری زانستی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی لەگەڵ سەرهەڵدانی چینی بۆرژوازی لەناو کۆمەڵدا پەیـدا دەبێ‌و ( ئەحمەدی خانی )یش وەك بیرکەرەوەو شاعیرو فەیلەسووفێك سەیری مەسەلەی نەتەوەیی کوردی کردووەو بە پێش شاعیرو زاناکانی سەردەمی خۆی کەوتۆتەوەو بـە باشی جـەوهەرو حەقیقەتی مەسـەلەی

کوردی لە سەردەمی خۆیدا دەست نیشان کردووەو ، ئەوەی خستۆتە ڕوو کە هەردوو ئیمپراتۆریەتەکەی عوسمانلیو فارسەکان دەستیان بە سەر بەشێکی زۆری کوردستاندا گرتووەو ، هەوڵی ئەوەیان داوە کە دەستەلاتی میرنشینی‌یە کوردەکان نەهێڵن(١٤)و ، بەردەوام جەنگو کوشتاری گەرم لە نێوانی کوردو ئەو دوو دەوڵەتە گەورەیە بەرپا بووەو میرنشینی‌یەکی کورد کە دەرووخاو لەناو دەچوو ، میرنشینی‌یەکی دیکەی لە هەمان شوێن یان لە لایێکی دیکەدا سەری هەڵدەدا ، هەروەك خانی ئەو ژێردەستی‌یەی کورد بە دەست ئەو دوو هێزە گەورەیە دەردەبڕێو دەڵێ :ـ

**غالیب ندبوو لسەر مە ئەو روم**
**نە دبوونە خەرابەیی د دەست بووم (١٥)**
**مەحکوومو عەلەیهی‌یی صەعالیك**
**مەغلووبو موطیعی تورکو طاجیك (١٦)**

لەدواییدا ( خانی ) بە ڕێگایێکی زانستیانە هۆیەکانی ئەو داگیرکردنە دەست نیشان دەکاتو دەیان باتەوە سەر ئەو شوێنو جێگەیەی کوردستان ، کە کەوتۆتە نێوانی هەردوو ئیمپراتۆریەتەکەی عوسمانلیو فارسەکانو ، هەریەك لەوانە چۆن تەماعی لە خاکی ئەوی تریان دەکردو هۆی یەکەمو سەرەکیشیان دەست بەسەرداگرتنی کوردستان بووەو(١٧) دەڵی :ـ

**ئەڤ رومو عەجەم بوان حەصارن**
**کرمانج هەمی لە چار کنارن**
**هەردوو تەرەفا قەبیلی کرمانج**
**بۆ تیری قەزا کرینە ئارمانج (١٨)**

دوای ئەمە زیاتر لە سەر باری ژیانی کوردی ئەو سەردەمە لە نێوانی تەماعی ئەو دوو دەوڵەتە داگیرکەرە دەڕواتو دەڵێ : ئەو کوردانە لە سەر سنووری هەردوو لایان وەکو کلیل وانو هەر عەشیرەتێکیان سەددێکی بەهێزە لە بەر دەمیانو وەکوو دەریای رۆم ( دەریای رەش )و دەریای تاجیك ( دەریای قزوین ) وان ، هەر جارێك ئەو دوو دەوڵەتە جووڵابنەوەو کەوتبنە شەڕ ، کوردیان لە خوێنی خۆیاندا گەوزاندووەو(١٩) دەڵێ :ـ

**گویا کو لسەرحەدان کلیدن**
**هەر طائیفە سەددێکی سەدیدن**
**ئەڤ قولزمو رومو بەحری تاجیك**
**هندی کو دەکەن خروجو تەحریك**
**کرمانج دبن بخون ملطخ**
**وان ژیکفە دکن مثالی بەرزەخ (٢٠)**

خانی دوای ئەمە لە بەدبەختی نەتەوەی کورد دەدوێ کە لە سەردەمێکی زووەوە خودا وای کردووە بکەونە ژێر دەستی ئەو رومو عەجەمانەو هەریەکە بە ئارەزووی خۆی بیانچەوسێننەوەو ئەویش ئاخی دڵی خۆی هەڵ دەرێژێو دەڵێ :ـ

**ئەمما ژ ئەزەل خودێ وەساکر**
**ئەڤ رومو عەجەم ل سەر مە راکر (٢١)**

لە دوای ئەمەدا دەڵێ : « من سەرم لە حیکمەتو کاری خودا سوڕماوە لەبەر چی لە هەموو دەوڵەتی دنیادا هەر کورد بێ بەش ماونەتەوە ؟ بۆچی هەموویان بونەتە ژێردەستەو ، لەم بارەیەوە دەڵێ :ـ

ئەز مامە د حیکمەتا خودێـدا
کرمانج د دەولەتا دنێدا
ئایا بە چ وەجە بوونە مەحرووم
( بالجملة ) ژ بو چ بوونە مەحکووم (٢٣)

**خانی‌و شیعری سیاسی کوردی :ــ**

هەرچەند ( خانی ) گیانێکی یاخی بووی شۆرشگێری بووە ، بەڵام ئەو یاخی بوون‌و شۆڕشگێری‌یەی بەرامبـەر بە گەلەکەی بەتێـکڕایی بەکارنەهێناوە بەڵکوو وەك رۆڵەیێکی تێگەیشتووی هوشیاری بـە زمانی شیعری سیاسی هۆی ئەو دواکەوتن‌و ژێردەستی‌یەی گەلەکەی دەخاتـە ئەستۆی حوکمدارو میرە کوردەکان چونکە لەناو خۆیاندا ناکۆك بوون‌و ئەمەش بە شوورەیی‌یێکی گەورە دادەنێ‌و پیاوی شاعیرو مرۆڤی هـەزار لەو کارەساتە بێ گوناهـو بێ تاوان دادەنێ‌و(٢٤) وەك سیاسی‌یەکی ئەمڕۆ بییردەکاتەوەو دەڵێ :ــ

تابعیتی وان ئەگەر چی عارە
ئەو عارە ل خەلقی نامدارە
ناموسە ل حاکم‌و ئەمیران
تاوان چیە شاعیرو فەقیران (٢٥)

ئینجا دێتە سەر باسی جوامێری‌و سەخاوەت‌و پیاوەتی‌و ئازایـەتی‌و دڵقایمی کوردان‌و دەڵێ : « ئەمانە هەمووی وەك کالایەکن بە قەد باڵای کورد بڕاون‌و ئەوان هیممەت‌و دادیان بە شێر بەخشیوەو ئـەم غیرەت‌و هیممەت بەرزی‌یەیان بووەتە مایە ئەوەی منەتی هیچ کەسێك هەڵ نەگرن‌و دەڵێ :ــ

جامێری‌و هیمەت‌و سەخاوەت
میرێنی‌و غیرەت‌و جەلادەت

**ئەو خەتمە ژ بۆ قەبیلی ئەکراد**

**وان دانە بە شێری هیمەت‌و داد (٢٦)**

بەڵام داخەکەم لەبەر ئەوەی ئەو کوردانە هەمیشە لەگەڵ یەکدی‌دا نارێـك‌و ناتەبان‌و دوو بـەرەکی‌و ناکۆکی ڕووی تێ کـردوون ، ئـەم ڕەوشتە خراپەیان بۆتە مایـەی ئەو دواکـەوتن‌و ژێر دەسـتی‌یەیان‌و ، دەڵـێ :ـ

**لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن**

**دایم ب تەمەرودو شیقاقن (٢٧)**

دوای دەست نیشان‌کردنی ئەو دەردی ناڕێکی‌و دووبەرەکی‌یـەی نەتەوەی کورد ، جۆرە چارەیەك بۆ ئەو دیاردە کۆمەڵایەتی‌یەو سیاسی‌یەی کۆمەڵگای کورد دەخاتە ڕووو ئەو چارەیەش لە ڕێـکەوتنی ڕۆڵەکانی‌و سەرددانەواندنیان بۆ سەرکردەیەکی سیاسیی خۆیان ، ئەو کات هەموویان بە یەکەوە ئایین‌و دەوڵەتیان دەبووو ، هەوەها عیلم‌و حیکمەتیشـیان بـە تەواوی دەست دەکەوت‌و دەڵێ :ـ

**گەر دی هەبوا مە ئیتیفاقەك**

**ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەك ،**

**تەکمیل دکر مە دین‌و دەولەت**

**تەحصیل دکر مە عیلم‌و حیکمەت (٢٨)**

لە لایێکی دیکەدا ( خانی ) زیاتر لە مەبەسـتی دڵی خـۆی نزیـك دەبێتەوەو دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە بڵێ : ئەگەر ئێمەی کورد پادشایەك‌و تاجێکمان ببوایە ، ئەو کاتە وەك ئەم ڕۆم‌و عەجەمەی کە کوردیان ژێردەست کردووە ، نرخ‌و ڕەواجێکمان دەبوو ؟ دیسانەوە دەڵێ : « ئەگـەر ئێمـە تەختێکی شاهانەو بەختێکمان ببوایەو ئەو شایەمان تاجێکی ڕەوا دیترابایە،

ئەو کاتە ئێمەش لە ناو نەتەوەکانی جیهاندا بەهاو ڕەواجێکمان دەبوو ، دەڵـێ :ــ

**گەردی هەبوا مە پادشاهەك**
**لایق بدیا خودێ کولاهەك**
**تعیین ببویا ژ بوووی تەختەك**
**زاهیر ڤە دبوو ژ بۆ مە بەختەك**
**حاصل بە بویا ژ بۆ وی تاجەك**
**ئەلبەتتە د بوو مە ژی ڕەواجەك (٢٩)**

وەك سەرنج لە مێژووی ئەدەبی کوردی دەدەین ، دەبینین بەر لـە ( ئەحمەدی خانی ) مەگەر شاعیریکی وەکـو ( مـەلای جزیـری ) بـۆ شانازیی بە خۆوەکردن لە شیعرەکانیدا ناوی کوردستـانی هێنابێ دەنـا چاومان بە بەرهەمی شاعیریکی دیکەی کورد ناکەوێ خۆی وەك خانی خستبێتە مەیدانی شیعری سیاسیو دەستنیشان کردنی دەردی بێ قەوارەیی سیاسیو بێ سەرکردایەتی نیشتمانی کوردی ژێردەستی عوسمانلیو عەجەمو وا بیری لە چارەی ئەو ناکۆکیو دواکەوتنی ژیانی ژیردەستی بکاتەوە ، بام چارە کردنەکەیشی لە ڕادەی کارەسـاتی نەتەوەکەیشـی نەبـووبێو هەمووی هەر خۆزگەو ئەگەر بووبێ ، بەڵام دیسانەوە هەنگاوێکی نـوێ بووە لە مەیدانی سـیاسـەتو بواری ئـەدەبی کوردیی ئـەو سـەردەمە هاویشتراوە ، چونکە ئـەدەب لە سەردەمی ئـەو شـاعیرە لە سـنوورو چوارچێوەی غەزەلی دڵداریو شیعری پێداهەڵدانو خواپەرستیدا نەچۆتە دەرەوە ، باو باوی وەسفی زوڵفی درێژو ئـەبرۆی کـەوانو چاوی بازو برژانگی تیرو ددانی مرواریو لێـوی یاقووتو کوڵمی ئاڵ بووەو ، بـە هیچ جۆرێك لە بارەی کۆمەڵایەتیو ئابـووریو سـیاسیی نەتـەوەکەیان نەدواون •

تا ( ئەحمەدی خانی ) نە هاتووە کەسێکی دیکە لە شاعیرانی کورد باری ناهەمواری کوردستانی ژێر دەستو ، دابەش کردنی بەسەر دەوڵەتەکانی عوسمانلیو عەجەمدا چارە نەکردووەو زامی کوشندەی کوردی نەزانو پاش کەوتووی تیمار نەکردووەو تاکە شیعرێکیان لەسەر باری نەتەوەیی گەلەکەیان دانەناوە • بۆیە ( خانی ) یەکەم شاعیری کورد بووە ڕچەی ئەو ڕێبازە تازەیەی لە شیعری کوردیدا شکاندووەو بابەتێکی تازەی خستۆتە پاڵ بابەتەکانی شیعری کوردیو کردوویەتی بە تەوەرەی هونەری شیعرەکانیو ، ئەوەی شیاوی باسیشە ( خانی ) ماوەی ئەوەی نەداوە ، شیعرەکانی لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی شیعری ڕەسەن دوور بکەونەوە ، کە فۆڕمو بیرو سۆزو ئەندێشەن ؟ چونکە کە ئەو شیعرانەی دەخوێنییەوە هەست بە سۆزو هەژاندنێکی لە ناخەوە دەکەی ، نەك تەنیا هەست کردن بە ماناو کێشو سەرواى شیعرەکانی •

گرنگی کردارەکەی ( خانی ) لەوەدایە کاتێك ئەو شیعرانەی گوتووەو دەماری نەتەوایەتی بزوتووە ، کە جارێ هەستی نەتەوایەتیی ڕاستەقینە وەك دەنگدانەوەی بزووتنەوەیێکی سیاسی زانستیانەی لەسەر ژێرخانێکی ئابووری گەلی کورد دامەزراو سەری هەڵنەدا بوو ، تاکوو لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا لە ١٧٨٩ دا و ، لە ئەنجامی هاتنە سەرحوکمی چینی بۆرژوازیی نیشتمانی ئەو هەستە نەتەوایەتییە لە فەرەنسادا خوڵقاو ، بە ماوەیەکی کەم بە هەموو لایەکی ئەوروپاو جیهاندا بڵاوبووەوەو ، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا پریشکی بیرو باوەڕی ئەو شۆڕشە گەیشتە ناو نەتەوە ژێردەستەکانی عوسمانلیو ئێران •

**شیعری سیاسی کوردی لە دوای خانیدا :**

بە نەمانی ( خانی )و لەناوچوونی زوربەی میرنشینییە

کوردی‌یەکانی کوردستانی تورکیا ، شیعری سیاسیی کوردی جۆرە کزی‌و بێ دەنگی‌یەکی بەسەردا هات ، تاکو لە کرمانجی خواروودا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا نالی [ ۱۸۰۰ - ۱۸۵٦ ] سەری هەڵداو بنچینەی قوتابخانەی شیعری بابانی دامەزراندو ، بەشە دیالێکتی سلێمانی دوای تێکەڵاو کردنی بە ووشەی جوراو جۆری شێوەکانی تری کوردی کرد بە بەردی بنچینەی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی کە تا ئێستاکەش لە کوردستانی عیراق‌و ئێراندا ئەم زمانە ئەدەبی‌یە لە لای زۆربەی خوێندەوارانی کورد ، زمانی خوێندنەوەو نووسین‌و بڵاوکردنەوەیە ، نالی شاعیری بەهرەداریی ووردەکاریی ڕەوانبێژی کوردی بوو ، زۆربەی شیعرەکانی شیعری دڵداری و وەصفی جوانی‌و خۆشی ووڵاتەکەی‌و پیدا هەڵدان‌و ستایشی میرە لێوەشاوەکانی میرنشینیی بابان بوون • هەرچەندە لە هەندێ پارچە شیعری‌دا هەستی نەتەوایەتی‌و خۆشەویستی‌ی کوردستانی لێ هەست پێ‌دەکرێ ، وەك لە نامە شیعری‌یە بە ناوبانگەکەی بۆ [ سالیمی صاحێبقڕان ] ی شاعیری دۆستی دڵسۆزی ناردووە ، ئەو هەست‌و سۆزە نەتەوەیی‌یەی دەنوێنێ • وەیاخود لەو کاتەی کە شانازی بەوەوە کردووە کە کوردەو بە زمانی کوردی شیعری گوتووە(۳۰) ، لەو کاتەی کە رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە هەموویان پەروەدەی حوجرەی مزگەوتەکان بوون‌و ، کوردی نووسینیان لەلا کارێکی دوور لە هونەری ئەدەبیات‌و شیعر بوو ، ئەو گوتوویەتی :-

**تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**
**ئیمتیحانی خۆیە مەقصوودی لە عەمدا وا دەکا (۳۱)**

لەگەڵ ئەوەشدا نالی لە کاروانی شیعری کوردیدا بە شاعیری نەتەوەیی‌و سیاسی دانانرێ ، بەلکوو ئەو کارەی کردوویەتی تەنیا

ڕێخۆش کردنێك بوە بۆ سەرهەڵدانی شاعیری دیکەی کوردو شیعر بەو زمانە ئەدەبی یە یەکگرتووە نوێ یە دابنێن و پتر بچنە ناو بابەتی شیعری سیاسی ، وەك ( سالیمی صاحێبقڕان ١٨٠٥ـ ١٨٦٩ ) کردی و لە چامە ناودارەکەی ( جەنگی بابان و عوسمانلی یەکان ) دا سۆزی نەتەوایەتی و لایەنگیریی بێ سنووری بۆ کوردە بابانەکـان ـ کـە خۆی یەکێك بووە لەوان ـ زۆر بە جوانی دەردەبڕێ و چ کارو خووو ڕەوشتێکی ناشیرین و خراپ و نائینسانانە هەیـە دەیداتـە پاڵ عوسـمانلی یـە داگیرکەرەکانی وولاتەکەی و دەڵێ :ـ

**صاعیقەو بەرقی نحووسەت زولمەتی دا شەرق و غەرب**

**بەردە بارانە بە مەخصووصی لە سەر موڵکی بەبان**

**چاوی عیبرەت هەڵبڕە ئەی دڵ لە وەضعی دەهری دوون**

**سەیری کە ڕۆمی دەڵەك چی کرد بە زومرەی کورد زبان (٣٢)**

لە دوای ئەمەدا ( سالیم ) باسی ئەوە دەکات کە چۆن عوسمانلی یە داگیرکەرەکان بەگژ قارەمانەکانی کورددا دێن و حـەیتە زرتە بۆزەکانی تورك بە شاهۆی گێژو ، شەڕ کەرە کـوردە دلێرەکانیش بە ( باڵەبان ) دەچوێنێ ، کە باڵندەیەکی خێرای ڕواکەرەو لە باز گەورەترەو دەڵێ :ـ

**مەردی مەیدان هاتە جەولان باز لە ڕەنگی تەپلی باز**

**« حەیتە » وەك شاهۆیی گێژو کورد بە میسلی ( باڵەبان ) (٣٣)**

ئینجا بە جۆرێکی هونەرمەندانە هەستی نەتەوەیی هەموو کوردێکی هوشیارو دڵسۆز دەبزوێنێ ، بە باس کردنی تێکەڵاو بوونی هەردوو سوپای تورك و سوپای کورد لە شیوەکەی پیرمەسووورداو دەڵێ :ـ

**ڕەنگی سەحرای مەحشەری بوو شیوەکەی لای پیرمەسوور**

**گرمە گرمی تۆپی ڕۆمی هەو هەوی سوارەی بەبان (٣٤)**

سالیمیش هەرچەندە ئەم قەسیدە سیاسی‌یەی وەك داستانێكی شیعری لە بارەی شەڕە وێرانكاری‌یەكەی نێوانی عوسمانلی داگیركەرو كوردە بابانەكان داناوەو ، هەستی نەتەوایەتی كوردو هەڵوێستی هەندێ چین‌و توێژی كۆمەڵگای كوردی دەربڕیوە بە تایبەتی بازرگان‌و خاوەن بەرژەوەندەكانی ناو شاری سلێمانی ، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین بڵێین سالیم لە كاروانی ئەدەبی كوردیدا بە شاعیری شیعری سیاسی دەدرێتە قەڵەم ؛ چونكە ڕێبازە گشتی‌یەكەی لە شیعردانانەدا لە چوارچێوەی غەزەل‌و وەصف‌و ستایش نەچۆتە دەرەوە •

**حاجی قادری كۆیی‌و شیعری سیاسیی :ـ**

ئەگەر ئێمە بەپێی كات‌و سەردەم بە دوای كاروانی شیعری كوردیی سەدەی نۆزدەهەم بكەوین‌و شیعری سیاسی لێ وەرگرین دەبینین دوا بە دوای هاتنی سالیم‌هیچ شاعیرێكی كورد وەك حاجی قادری كۆیی [١٨١٧- ١٨٩٧ز] خۆی لەو جۆرە شعرە نەداوەو ئەوەندە لە باری نا لەباری ژیانی نەتەوەی كوردو خاكی كوردستان شیعری سیاسی دانەناوەو وا بە ئاشكرایی ڕەگەزەكانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازیی كوردی چارە سەر نەكردووە • هەرچەندە شاعیرێكی بە دەستەڵاتی وەك شێخ ڕەزای تاڵەبانی [١٨٣٦- ١٩١٠ز] هەندێ یادگاری مێژوویی سەردەمی حوكمڕانی‌ی بابانەكانی بۆ تۆمار كردووین‌و لە چامەیەكی‌دا پێشكەشی كردووین‌و لە سەرەتاكەی‌دا دەڵێ :ـ

**لە بیرم دێ سولەیمانی كە دارولموڵكی بابان بوو**
**نە مەحكوومی عەجەم نە سوخرەكێشی ئالی عوسمان بوو**
**لە بەر تابووری عەسكەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا**
**سەدای موزیقەوو نەققارە تا ئەیوانی كەیوان بوو (٣٥)**

ئەم کارەی شێخ رەزا ناگاتە ڕادەی ڕێبازە پان‌و بەرینەکەی حاجی قادری کۆیی کە زۆربەی زۆری بەرهەمە شیعری‌یەکانی دەوکەنە بەر چەمك‌و ناو چوارچێوەی شـیعری سیاسـی‌و هـەمووی خـەمخۆری‌و چارە دانانە بۆ گیرو گرفتە سیاسی‌یەکانی نەتەوەی کورد ، چونکە لـــە سەردەمێکی سیاسی وادا ژیاوە « لە لایێك بیرو باوەڕی نەتەوایەتی میللەتە ژێر دەستەکان‌و ، لە لایێکی ترەوە خەباتی زەحمەت کێشان‌و رۆشنبیرانی رۆڵەکانی ئەم نەتەوانە ، روژ بە رۆژ زیاتر دامو دەزگای ئۆتۆکراتی‌یەتی تورك‌و فارسیان لە مردن نزیك دەکردەوە • »(٣٦)

حاجی شاعیری نەتەوەیی کورد بە پێی ســـەردەم‌و باری ژیانی دواکەوتووی میللەتەکەی گەلێ پێش سەردەمی خۆی کەوتبووەوەو وەك رۆشـنبیریکی سـیاسی‌ی هاوچـەرخ سـەیری مەسـەلەی نەتەوایـەتی کوردی کردووە ، چونکە هوشیاریی رۆشـنبیران‌و چینی ناوەنـجی‌و خاوەن پیشەکان لە ڕادەی بزووتنەوەیـــکی نەتەوەیی‌دا نەبوو ، بـەلام دەبینی لە ریگەی رۆشنبیریی نوێ‌و بیرکردنەوەی هوشـیارانەی خۆی شیعرەکانی لە ئاستی هەستێـکی نەتەوەی پێگەیشـتووو ، بزووتنـەیێکی سیاسی پێشکەوتووی ڕاست‌و تەواودا بووە •

### تارمایی خانی لەناو شیعرەکانی حاجی‌دا :

لە سەرەتادا شیعرە سیاسی‌یەکانی (حاجی) بە ئاشکرا تارمایی خانی پێوە دیارە ئەمەش لەو کاتـــەدا بوو کە حـاجی قادر لە نوێ چـووبووە ( ئەستەمبۆڵ )و لەوێ لە رێگەی خوێندنەوەی دیباچەکەی «مەم‌و زین»و بیستنی هــەواڵی نەتەوەو وولاتەکـانی ئەوروپاو بـەرپابوونی شـۆڕش‌و ڕاپەرینی نەتەوەیی لە ناویاندا لە پێناوی ئازادی‌و سەربەخۆییدا ، ئەمانەی لە ڕێگەی خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو کاتی ئەسـتەمبۆل پێ

دەگەیشت ، ئەویش ئاهێکی ساردی بۆ دواکەوتنی میللەتەکەی‌و ژێر دەستی هەڵدەکێشا . لە سەرەتادا کارتێکردنی شیعرەکانی ( خانی ) لە شاعیریەتی‌دا بە ئاشکراو روونی‌دیارە وەك ئەم نموونانەی خوارەوە :ـ

خانی لە دیباچەکەی « مەم‌و زین » دا لە بەخشندەیی‌و ئازایەتی میرە کوردەکان دەدوێ‌و دەڵێ :ـ

**هەر مێرەکی وان بە بەزلی حاتەم**

**هەر مێرەکی وان بە رەزمی رۆستەم (۳۷)**

دەبینین ( حاجی قادر )یش لە هەڵبەستێکی‌دا بۆ هەمان مانا پەنای بردۆتە بەر سەخاوەتەکەی حاتەم‌و ئازایەتی‌یەکەی رۆستەم‌و دەڵێ :ـ

**خۆ دەزانن سولالەیی ئەکراد**

**لێرەوە بگرە تا دەگاتە قوباد**

**دان‌و بەخشینیان لەلا باوە**

**خوێنی مەیدانیان لەلا ئاوە**

**بە شەجاعەت هەموو وەکوو رۆستەم**

**بە سەخاوەت هەموو وەکوو حاتەم (۳۸)**

حاجی نەك هەر لەم هەڵبەستەی‌دا رەوشتی بەخشندەیی ( حاتەمی تەی ) و پاڵەوانێتی‌ی ( رۆستەم )ی وەکوو خانی بەکارهێناوە بەڵکوو لە هەڵبەستە پرسۆزەکەی ( لە رۆما کەوتە بەر چاوم ) یشدا ئەوە دوو بارە دەکاتەوەو دەڵێ :ـ

**گەلێکم بیستووە پەستی‌و بڵندی دەولەتان ئەمما**

**جیهان نەی دیتووە پەستی میسالی حاکمی کوردان**

**لە وەختی خۆی هەموو شا بوون سەراپایان خرۆشابوون**

**لە بەخشین ( حاتەمی تایی ) لە شەڕدا ( روستەم )ی مەیدان (۳۹)**

وەك لەم دوو نموونەیەدا بۆمان دەردەکەوێ ( سەخاوەتەکەی حاتەم ) و ( ئازایەتی‌یەکەی رۆستەم ) لەلای هەردوو شاعیری نەتەوەیی کورد هاتوون ، بەلام لە هەمان قالب‌و مانادا نین • چونکە لەلای خانی بۆ ( میر )ی کورد گوتراوە ، کەچی لەلای حاجی کۆیی بۆ ( سولالەی ئەکراد ) واتا : کورد وەك نەتەوەیەك نەك تاکە کەسێك گوتراوە ، ئەمەیش دەگەرێتەوە بۆ گۆرانی بارو سەردەمی کورد ، کە لەکاتی خانی مێژو هەر مێژووی میرو پاشایان بووە ، کەچی لە سەردەمی حاجی‌و دوای شورشە نەتەوەیی‌یەکانی ئەوروپا ، باری مێژووی جیهان گۆراوەو بووە بە مێژووی گەل‌و نەتەوان ، نەك مێژووی سەردارو کاربەدەستان •

خانی لە شوێنێکی دیکەی دیباچەکەی ( مەم‌و زین )دا دەکەوێتە ناوگیرو گرفتەکانی نەتەوەی کوردو هۆیەکانی دواکەوتن‌و ژێردەستی‌ی ولاتەکەی‌و دەلێ :-

**دا خەلق نبێژتن کو ئەکراد**
**بی مەعریفەتن بی اصل‌و بنیاد**
**ئەنواعی میلەل خودان کتێبن**
**کرمانج تنێ دبی حسێبن (٤٠)**

حاجی قادریش لە بارەی نەخوێندەواری‌و بێ نووسینی‌ی کوردانەوە لە چەند پارچە هەلبەستێکی‌دا بە هەمان ماناو مەبەستەوە دەلێ :-

**هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت**
**بێ بەهرە لە خوێندن‌و کیتابەت (٤١)**

یاخود لە شوێنێکی دیکەی هەر ئەو هەلبەستەی‌دا دەلێ :-

**میللەتی بێ کتێبو بێ نووسین**
**غەیری کوردان نی یە لەروویی زەمین**

دوای دەست نیشان کردنی ئەو دەردە کۆمەلایەتی یەی کۆمەلگای کورد ( خانی ) ڕاستەو خۆ دەکەوێتە ناو مەیدانی سیاسەتو دەردی ژێردەستی کوردو گیرۆدە بوونیان بە دەست حوکمی عوسمانلی (رۆم)و ئێران ( عەجەم ) ەوە ، لە چەند دێڕە شیعریکیدا ئەو دەردە سیاسی یە دەست نیشان دەکاتو دەڵێ :ـ

**ئەڤ رۆمو عەجەم بوان حصارن**
**کرمانج هەمی لە چار کەنارن**
**هەردوو تەرەفان قەبیلی کرمانج**
**بۆ تیری قەزا کرینە ئارمانج (٤٢)**

خانی لەم دوو دێڕە شیعرەیدا ئەوەمان بۆ دەردەبڕێ کە (رۆم)و ( عەجەم ) بەو کوردانە پارێزراونو بۆ هەردوو دەوڵەتان بوون بە پەرژینو هەردوو لایان کرمانج (کورد) یان کردووە بە ئامانجی تیری قەزاو بەڵای خۆیان •

دەبینین ( حاجی قادر ) یش ناوی ئەو دوو دەوڵەتە هەر بە ناوی (رۆم)و (عەجەم) دێنیو کوردیش بە ژێر دەستو مەحکوومی ئەوانە دەداتە قەڵەم کە واقیعی حالیان بووە ، چونکە هەروەکوو ئاشکرایە ، « ئەگەر لە دوا دوای سالانی سەدەی نۆزدەهەمدا چاوێك بە نەخشەی نەتەوایەتی میللەتی کورددا بخشێنین ، دەبینین خاکی کوردستان لە رووی نەخشەی سیاسی یەوە کرابوو بە دوو بەشەوە ، بەشی باکووری ـ رۆژئاواو خوارووی پارچەیێك بوو لە خاکی سولتانی عوسمانیو ، بەشی باکووری ـ رۆژهەلاتو رۆژهەلاتی پارچەیەك بوو لە خاکی شاهەنشای

قاجاری ئێران » (٤٣) • حاجی لە بارەی ئەو دابەش کردن‌و ژێر دەستی یەی کوردانەوە دەڵێ :ــ

**ژێر دەستی ( عەجەم ) موطیعی ( ڕۆم ) ن**
**مەحکوومی خەڕات‌و حیزو دۆمن (٤٤)**

حاجی ( عەجەم ) و ( روم ) کە ئێرانی‌یە قاجاری‌یەکان‌و تورکە عوسمانلی‌یەکان بوون بە ( خەڕات‌و دۆم ) دادەنێ‌و وا دیارە لە سەردەمی ئەودا ئەوەی بۆ روون نەبۆتەوە کە ( دۆم ) تیرەیەکی کوردەو بە زۆری پیشەیان کلاش دروست کردنەو لە هەندێ شوێنیش خەڕاتی واتا : دارتاشی دەکەن‌و کەل‌و پەلی هەمە جۆر لەدار دروست دەکەن‌و ، نابێ بە چاوێکی سووك تەماشایان بکرێ ، بەلام وا دیارە بە سووك تەماشاکردنی ( دۆم ) لەلای حاجی ، دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی کۆچەری‌و دەربەدەرییان‌و ئەم بارەشیان وایان لێ دەکات بە زەوی‌یەکی تایبەتی‌یەوە نەنووسێن‌و هەستی نیشتمانی‌و نەتەوەییان لە لا کزو بێ‌هێزبێ‌و بەڵکوو دەتوانین بڵێین لە سەردەمی حاجی‌دا ئەو هەستەیان هەر نەبووە •

دیسانەوە حاجی قادر هەر لە بواری باسی (ڕۆم)و (عەجەم)ی داگیرکەرانی وولاتەکەیدا سەرکۆنەی کوردەکان دەکات‌و گلەیی ئەوەیان لێ دەکات کە کەسێکیان نەچۆتە دەرەوەی خاکی کوردستان‌و سەرێکیان لە وولاتە پێشکەوتووەکانی ئەوروپا نەداوەو چاویان نەکراوەتەوە ؛ بۆیە هەروا دەزانن لە هەموو جیهاندا تەنیا هەر پادشای ( ڕۆم : عوسمانلی )و شای (عەجەم : ئێران) هەنەو دەڵێ :ــ

**یەکتان نە چوونە گەردش وا تێ دەگا لە دنیا**
**هەر پادشاهی ڕۆمەو شاهی عەجەم لە تاران (٤٥)**

حاجی چونکە بینیەتی زۆربەی زۆری وولاتی کوردستان لە ژێر دەستی حوکمڕانی عوسمانلی بووە ، بۆیە پتر هێرشی بردۆتە سەریان‌و گەلەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە کە هەرگیز نابێ پشتیان پێ ببەستن چونکە وەکوو ( بەن )ی موو وانە ، زوو خاو دەبنەوە دەپسێن‌و پشتی هاوپەیمانەکانیان بەردەدەن‌و ، لەم بارەیەوە دەڵێ :ــ

**ڕۆمی وەکوو بەنی موون کەس پشتیان پێ نەبەستێ**
**کەوتوونە داوی خۆیان پەژموردە ماون حەیران (٤٦)**

حاجی پتر لەسەر دەست نیشان کردنی دوژمنە سیاسی‌یەکانی نەتەوە ژێر دەستەکەی خۆی دەڕوات‌و یەکەم جار بە ناوهێنانێکی ڕاستەو خۆی (ڕۆم)و (عەجەم)و دوا جاریش بە درکە ( کنایە ) ناویان دەبات • بۆ عوسمانلی‌یەکان نیشانەی ( کڵاو سوور ) یان بۆ دادەنێ چونکە ئەوان فێستی سووریان لەسەردەناو عەجەمە قاجاری ـ یەکانیش نیشانەی ( کڵاو ڕەش )ی بۆ بە کارهێناون چونکە ئەوان کلاوێکی ڕەشی وەکوو فێستێکی کورتیان لەسەر دەناو ، باری نا لەباری کوردستانەکەی دەردەبڕێ کە چۆن خاکەکەی وەکوو گای بەش بەسەر ئەو دوو دەوڵەتەدا دابەش کراوەو دەڵێ :ــ

**لە مابەینی ( کڵاو سوور )و ( کڵاو ڕەش )**
**پەرێشانین دەبینە میسلی گای بەش (٤٧)**

ئەحمەدی خانی هۆی دواکەوتن‌و ژێردەستی‌ی کورد دەباتەوە سەر نەبوونی سەرکردەیێکی لێ‌هاتووی خۆی‌و ئەگەر پادشاهێکی هەبوایە غەمخۆری بۆ نەتەوەکەی دەکردو لە ژێر دەستی پیاو خراپانی دەردەهێناو ئەو کاتە (ڕۆم)وا بەسەر ئێمەدا زاڵ نەدەبوو ، وولاتەکەشمان نەدەبووە کەلاوەی کونە پەبووی شوومو دەڵێ :ــ

**گەر دی هەبوا مە پادشاهەك**

**لایق بدیا خودێ کولاهەك**

**غەمخواری دەکر لمە یەتیمان**

**تینانە دەرێ ژ دەست لەئیمان**

**غالب ندبوو لسرمە ئەو ڕووم**

**ندبوونە خەرابەیی د دەست بووم (٤٨)**

بەڵام حاجی قادر بەپێی گۆڕانی باری مێژووو ، جیاوازیی سەردەمی ژیانی لەگەڵ سەردەمی ( خانی )دا ، هۆی دواکەوتنی نەتەوەی کوردو، وێران بوونی وولاتەکەی وەك پەپوو تێیدا خوێندبێو کردبێتی بە کەلاوە، ئەمانە هەمووی دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕێك نەکەوتنی کورد لە ناوخۆیانداو یەك نەگرتنی ڕۆڵەکانیو لەو بارەیەوە لە هەڵبەستێکیدا دەڵێ :ـ

**تا ڕێك نەکەون قەبیلی ئەکراد**

**هەروا دەبنە خەرابە ئاباد**

**هەر کوردن ئەگەرچی پاکی مەردن**

**پامالی زەمانە مەحوی کردن**

**هەر مانەوە بێ نەواوو مەزلووم**

**وەك بوومی خەرابەزاری مەشئووم (٤٩)**

تا ئەم رادەیە ( حاجی قادر ) سوودی لە ( ئەحمەدی خانی ) وەرگرتووە وەك تاقی کردنەوەیەکی ئەدەبیو سوود وەرگرتن لە کەلەپووری ئەدەبی شاعیرانی پێش خۆی ، نەك لاسایی کردنەوەیێکی کوێرانەو وەرگرتنی کەرەستەی ئامادەکراو •

**حاجی قادرو گروگرفتی سیاسیو چارەسەرکردنی :ـ**

دوای ئەو قۆناغە سەرەتاییەی تاقی کردنەوەی حاجی لە مەیدانی

شیعری نەتەوەیی‌و سیاسی‌داو سوود وەرگـرتن لە گیانی شـیعرەکانی ( خانی ) ، دەبینین دەکەوێتە مەیدانی داهێنانی نوێ‌و پێش‌خستنی شیعری سیاسی لە ئەدەبی کوردیدا •

لەو کاتەی کە (خانی) فرمێسکی بۆ باڵای ناهەمواری سیاسی کورد هەڵڕژاندووەو ئاخ‌و ئۆفی بۆ دواکەوتنی رۆڵـەکانی هەڵکێشـاوە دەبینین ( حاجی ) هەر بەوەندە نەوەستاوە بەڵکـوو دڵی لە ناو ئاگری کێشـەو گیروگرفتەکانی نەتەوەکەیدا برژاوەو بە پێی سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیی نوێی نەتەوایەتی ، چارەی بۆ کێشـەی سیاسیی کـوردستان‌و کورد دۆزیوەتەوە • لە بارەی هـەڵوێستی ئـەم دوو شاعیرە گـەورەیەماندا ، شاعیری نەمری کورد « گۆران ۱۹۰٤ـ۱۹٦۲ » لە هەڵبەستەکەی یادی بیکەس‌دا دەڵێ ـ

**لە باغێکا فرمێسکی ( خانی ) ئەڕژا**
**دڵی ( حاجی ) لە ئاگرا ئەبرژا (٥٠)**

حاجی قادر لە هەڵبەسـتە نیشـتمانی‌و سیاسـی‌یەکانیدا گیـرو گرفتەکانی نەتەوەی کورد دەست‌نیشان دەکات‌و لە هەمان کاتیشدا پێ بە پێ دەرمان‌و چارەیان بۆ دەدۆزێتەوە ، کە ئەمەش جیاوازیێکی سەرەکی نێوانی (خانی)و (حاجی) یە •

هەروەك لە مەوبەر هەستمان بەوە کـرد ( خانی ) هـەر دەردەکانی نەتەوەکەی دەست نیشان کردووەو ئەگەر بیریشی لە چارە سەرکردنیان کردبێتەوە هەمووی بە خۆزگەو ئەگەر بووە ، بەڵام حاجی وەك لەمەودوا چاومـان پێ دەکـەوێ ، بۆ هەر دەردێکی نەتەوەو خاکی وولاتەکـەی چارەیەکی راست‌و رەوانی بۆ دەدۆزێتەوەو ، بابـزانین چی کـردووەو چی گوتووە :ـ

١ ـ یەکەم دەردی سیاسیو کۆمەڵایەتی نەتەوەی کورد ڕێك نەکەوتنو یەك نەگرتنی ڕۆڵەکانیەتی ، (حاجی) یش بۆ ئەو دەردە کوشندەیە چارەی یەکگرتنی چینو توێژە ڕەنجدەرەکانی کوردو ، کۆبوونەوەیانە لە دەورەی سەرکردەیەکدا ، جا ئەو سەرکردەیە میرێکی کورد بووبێ یاخود بەگزادەیەکی لێ هاتوو بووبێ ، تاکو بتوانن بەرامبەر بە دوژمنی هاو بەشیان کە داگیرکەری وولاتەکەیانەو ، ڕەنجمژی بەرهەمی ڕۆڵەکانیەتی ، مەردانە بوەستنو بە سەربەخۆیی بژین وەك گەلاتی تر •

هۆی ڕێک کەوتنو یەکگرتنی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە ڕادەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتیو خۆ بە ڕۆڵەی یەك خاكو یەك نەتەوە زانین مەرجێکی سەرەکییە بۆ خولقاندنی جووڵانەوەیەکی سیاسی ، ئەم هەستە نەتەوەییەش لە هەڵبەستەکەی ( لە ڕۆما کەوتە بەر چاوم )ی حاجیدا لەو پەڕی جۆششدا خۆی دەنوێنێ ، هەروەك لەم چەند دێڕە شیعرەیدا هەستی پێ دەکەین کە دەڵێ :ـ

**لە ڕۆما کەوتە بەر چاوم کەسێکی هایڕو حەیران**
**لە ڕەنگا تێگەییم کوردە بە شێوەی کوردی کوردستان**
**کە چوومە خزمەتی پرسیم برادەر خەڵکی کام جێگەی ،**
**لە کام جێ هاتووی ؟ گریاو گوتی : بابان ، گوتم : بابان !**
**گوتی : بۆ غوربەتیو رووتی نی‌یە گریانو هاوارم**
**لە داخی حاکمی خۆمەو لە شانو شەوکەوتی تورکان (٥١)**

لەو کاتەی کە (خانی) بۆ چارەسەرکردنی هەر ناتەواوی‌یەکی نەتەوەی کورد ئەگەرێکی بە کارهێنابێ ئەوا (حاجی) بە شێوەی داخوازی‌کردنو فەرمان دەرکردن بۆ چینو توێژە ڕەنجدەرەکانی

کۆمەڵگای کوردە ، ئەو رێك کەوتنەی لێ ویستوون وەك لەم دێرە شیعرەیدا بۆمان دەردەکەوێ :ــ

**لەم بەینە ئیتیفاقێ پەیدا بکەن بە مەردی**

**فەرقی نەبێ شوانو جوتیارو میرو گاوان (٥٢)**

لە سەدەی رابوردوداو لە سەردەمی حاجی قادردا کـارێکی زۆر ئاسایی بووە کە بەرژەوەندی شوانو جوتیارو ، گاوانێك کە هەموویان لە چینی زەحمەتکێشن لەگەڵ بەرژەوەندی میرێکی کورددا بگونجێ چونکە ئەمیش وەك ئەوان ژێر دەستو زەبوونی بەر دەستی دوژمنی داگیر کەری خاکەکەی بووە ، مەسەلەکەش مەسەلەی نیشتمانی بووە ، نەتەوەکـانی تری وەکوو بولگارو صەربو یونانو زۆر گەلی دیکەش هەر بەو رێگایە رزگاریان بووەو سەربەخۆیان وەدەست هێناوە •

حاجی قادر لە چەند هەڵبەستێکی دیکەشی‌دا هەر لە سەر گرنگی‌ی یەکێتی‌و یەکگرتنی رۆڵەکانی نەتەوەکەی دەڕواتو ئامۆژگاری ئەوەیان دەکات ، ئەگەر دەستی یەکدی بگـرنو واز لـە دوو بەرەکی‌و ناتەبایی بێنن نەك هەر دەبن بە گەورەی وولاتی خۆیانو بەسەربەخۆیی‌و ئازادی دەژین بەڵکوو دەبن بە خـــاوەنی هێزێـکی وا وەکو ( ئەســـکەندەری مەکەدۆنی ) هەموو دنیا بگرنو دەلێ :ــ

**بێ ئەگەر دەستی یەکتری بگرن**

**وەك ( سکەندەر ) جیهان هەموو دەگرن (٥٣)**

٢ ــ هەنگاوی دووەمی چارەســەر کردنەکەی حاجی بۆ مەســەلەی نەتەوایەتی کوردو رزگاربوونی کوردستان لە چنـگ حـوکمی عوسمانلی‌و عەجـــەمە داگیرکەرەکـانی ، دەست نیشـــان کردنی سەرۆکێك یا میرێکی کوردە بۆ سەرکردایەتی شـۆڕشی رزگاری

خوازی کورد لە دژی ئەو دوو دوژمنە گەورانە •

یەکەم جار حـاجی مێژووی ڕووناکو گەشی هەندێ لە میرو سەردارانی کورد دەخاتەوە یادی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیو سەردەمی ئازادیو سەربەخۆیی میرنشینەکانی کوردیان بە بیر دێنێتەوە ، تاکو هوشیاری‌یەکی سیاسییان بێ ببەخشێو ئەوە بزانن کە کورد خاوەنی ئەو مێژووە گەشەو رابوردوووە ڕووناکە بووە ، کەچی ئێستاکە وا کزیو نەهاتیو ژێر دەستی رووی تێ‌کردووە ، هەروەك لەم دوو دێڕە شیعرەیدا دەڵێ :ـ

**کوا والی‌یی سەنەندوج ؟ بەگزادەیی ڕەواندوز ؟**
**کوا حاکمانی بابان ؟ میری جزیرو بۆتان ؟**
**کوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازادو سەربەخۆ بوون**
**سوڵتانی موڵکو میللەت صاحیبی جەیشو عیرفان (٥٤)**

حاجی لە دوای ئەم هوشیارکردنەوەی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد لە مێژووی گەشی رابوردووی نزیکیان ، دەبینین دێتە سەر باسی سەردەمی ژیانی خۆیو لە بواری بیرکردنەوەی لە سەرکردەیەکی سیاسی بۆ پێشرەوی کردنی ئەو جووڵانەوە سیاسی‌یەی کە لە مێشکی خۆیدا نەخشەی بۆ کێشابوو ، هەرچەندە لێك دەداتەوە ، لە سەرەتادا کەسێکی وای ناکەوێتە بەر چاو تا ئەو کارە گرنگەی لێ بوەشێتەوەو یەکێك بێ بە توانستو لێ‌وەشاوە بێو ، ئاگاداری حاڵی میللەتو روژنامەو کتێبی تازەو مێژووی دەوڵەتو گەلان بێو ئاگاداری هەواڵی دەورو پشتو دوورو نزیکی وولاتەکەی خۆی بێ ، بۆیە یەکەمجار بە دڵێکی شکستو خەمبارەوە دەڵێ :ـ

کوڕێکی وا نی‌یه هەستێته سەر پێ
بزانێ خەڵکی چۆن کەوتوونه سەر پێ؟
بکا سەیری جەریدەو خاڵی میللەت
کتێبی تازەو تەئریخی دەوڵەت
بزانێ تا چ قەوماوه له ئەتراف
سەراپا ئاگره ئەترافو ئەکناف (٥٥)

دوای لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی باری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووریی نەتەوەی کوردو ، بە بێی بۆ چوون‌و قەناعەتی دڵی خۆی ئەم سەرکردایەتی‌یەی جووڵانەوەی سیاسی کورد دەداتە پاڵ بنەماڵەی بەدرخانی‌و لە دێڕە شیعرێکیدا ئەو دەورە گرنگەیان دەردەخات‌و دەڵێ :ـ

بەدرخانیو لەسەر لاچێ لەمەو پاش
له هەرلاوه دەتان هاڕن وەکوو ئاش

حاجی جگە لە تێکڕای ماڵی بەدرخانی ناوی تاکە کەسێکیشی دەبا لە یەك دوو بەیتی دیوانەکەیدا، هەرچەندە ناو بردنەکە نەختێکیش لە ژێر پەردەی ڕستە ئاراییدا بێ ، دیار دەدا کە مەبەستی شەخشی « یەزدان شێر » ی بنەماڵەی بەدرخانی‌یە (٥٦) هەروەك دەڵێ :ـ

ئەمیرێك ماوه پاشایه گوتی : کێ‌یه ؟ گوتم : شێره !
گوتی : لێره ؟ گوتم لێره ! هەتا تاران‌و هندستان
بە خۆی شێره وەکوو ناوی لە شەڕدا دوژمن ئەنداژه
تەمایان هەر بە ئەو ماوه تەواوی خاکی کوردستان (٥٧)

٣ـ هەنگاوی سێ‌یەمی چارەکردنەکەی حاجی بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی کورد ، لە بەشداری کردنی ( خامەو چەك ) دا دەست نیشان دەکات ، چونکه بە ڕای ئەوو بە ڕای ڕۆشنبیرو تێکۆشەرانی ئەم

سەردەمەشمان خەباتی سیاسی تەنیا بە (خامە) و نووسین ناکرێ ئەگەر چەکی لەگەڵدا نەبێو ، خەباتی شۆڕشگێڕیش تەنیا بە (چەك) نابێ ئەگەر لەپاڵ ئەو چەکەدا خامەو نووسینو ڕۆشنبیرییو تێگەیشتنی لەگەڵدا نەبێ ئەو دەورە گرنگە ناگێڕێ بۆیە دەڵێ :ـ

**شیرو قەڵەم شەریکن لەم عەسرەدا درێنا**

**شیرم قەڵەمتراشەو کالانییە قەڵەمدان (٥٨)**

حاجی ناتەواوییەکی گەورە لە کاروانی خەباتی سیاسی نەتەوەکەی دەست نیشان دەکات ، ئەویش نەبوونی چەکەو قەڵەمیش بە تەنیا کارێکی وای پێ ناکرێ ئەگەر هێزی چەکی لەگەڵدا نەبێ • بۆیە لە چەند دێرە شیعرێکی دیکەیدا ئەو ڕاستییە دووبارە دەکاتەوەو دەڵێ :ـ

**بە شیرو خامە دەوڵەت پایەدارە**

**ئەمن خامەم هەیەو شیر نا دیارە (٥٩)**

دیسانەوە لە شیعرێکی دیکەیدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چاك بوونی باری ژیانی کوردو پێشکەوتنی لەوەدایە چەکی ببێ تاکو پارێزگاری پێ لە خۆیەوە بکاتو ئەگەر نا ، نابێ ئەو کوردانە چاویان لە گەورەیی و ناوبانگ دەرکردن بێ ، چونکە گەورەیی بە بێ بوونی چەك نایێتە دەست ، هەروەك دەڵێ :ـ

**صەلاحی ئێوە ئێستاکە ( سیلاحە )**

**تەماعی گەورەیی بێ( چەك ) نەکەن نەك (٦٠)**

هەر لە بارەی نرخو گرنگی چەك لە خەباتی شۆڕشگێڕیی مەیدانی نەبەرد ، داوا لە ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەکات تاکو کەرەسەو چەکی شوڕشو جەنگ پەیدابکەنو لەو چەکە کاریگەرانەی شەڕی ئەو سەردەمیش [ تۆپو تفەنگو هاوەن ] بوون ، هەروەك دەڵێ :ـ

**جۆشێك بدەن وەگوو هەنگ تەدبیر بکەن بەبێ دەنگ ،**
**ئەسبابی شەڕ پەیا کەن ( تۆپو تفەنگو هاوان ) (٦١)**

حاجی قادر وەك سیاسیو شۆڕشگێڕێکی ئەمڕۆمان بیری لە گرنگی چەك لە خەباتی شۆڕشگێڕیی‌دا کردۆتەوە ، چونکە نەك جارێك بەڵکوو جارەها ئەوە دووبارە دەکاتەوە ، کە لە چەك بەو لاوە هیچ هێزێکی تر نابێتە خەمخۆرو پشتو پەنای گەلی کوردی بەش بەش کراوو ، لە کۆتایی هەڵبەستە ناودارەکەی [لە رۆما کەوتە بەر چاوم]دا ئەوەمان دەخاتە بەرچاوو دەڵێ :ـ

**هەچی جێگەی ئومێدمانەو ئەوەی دڵخوش دەکا ئەمڕۆ**
**( چەکە ) چۆن لەو بەدەر نابێتە غەمخۆری گەلی کوردان (٦٢)**

ئەوەی بۆمان دەرکەوت ئەو ڕاستی‌یە بوو ، ئەویش ئەوەیە : « شاعیری شیعری سیاسی هونەرمەندێکی بەهرەداری هوشیارو تێگەیشتووی ناو کۆمەڵەکەیەتیو ، خاوەنی هەستێکی ناسكو ئەندێشەیێکی قووڵو هەڵوێستێکی سیاسی نەگۆڕە بەرامبەر بە بزووتنەوەی مێژووی نەتەوەکەی بە تایبەتیو ، بزووتنەوەی رزگاری خوازی نەتەوەکانی نزیكو دووری گەلەکەی »(٦٣) لە گەڵ تێکۆشانی بەردەوامی چینو توێژە رەنجدەرەکانی کۆمەڵ بۆ ژیانێکی خۆشترو پاشە روژیکی گەشتردا •

ئەم خاسیەتانەی کە لە لای ئەحمەدی خانیو شیعرەکانی‌دا کەمتر هەست پێ دەکرێو ، زۆرتر لە لای حاجی کۆیی‌دا سەرهەڵدەدەنو چاکتر لەگەڵ شیعری سیاسی‌دا دەگونجێن ، چونکە شیعرەکانی حاجی پتر خۆیان لە رەگەزی کاتو شوێنو بزووتنەوەی مێژوو دەئاێنن و ئەو دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازیی سەردەمی ئەو دوو کەڵە شاعیرە

نەتەوەیی‌یەمان‌و ، جیاوازیش لە نێوانی ئەو دوو سەردەمەدا بەلانی کەمەوە سەدەیەك پترەو ئەو ماوەیەش مەودایێکی باشە بۆ گۆڕانی باری ژیانی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی کورد •

حاجی لە سەرەتای شیعری سیاسی دانانیدا وەك شاعیرانی پێشوومان، هەر خەونی بە رابووردووی نەتەوەکەی‌و مێژووی ڕووناکی میرنشینی‌یەکانی‌یەوە بینیوە ، کەچی کە پتر لە شاری ( ئەستەمبۆل ) ماوەتەوە ، « ئەو ئەستەمبۆلەی کە نوختەی لە یەك دان‌و بە یەك گەیشتنی رۆژ ئاوای پێشکەوتووی سەرمایەدارو رۆژهەلاتی دواکەوتووی دیلی کۆت‌و زنجیری دەرەبەگی‌و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بووو ، »(٦٤) مەلبەندی رۆشنبیریی‌و زانست‌و ئەویش ڕۆشنبیرێکی نوێی وەرگرتووەو بە گوڕ داوای تێکدان‌و لەناوبردنی هەموو نەریتێکی نا پەسەندی کۆمەلێ کوردەواری کردووەو نەخشەی بۆ ژیانێکی نوێی هاوچەرخانەی بۆ نەتەوەکەی کێشاوەو ، داوای لە رۆلەی کورد کردووە بە پێی سەردەم‌و رۆلی رۆژگار ژیان‌و ڕێبازی گوزەرانی خۆی بگۆڕێ ، چونکە هەموو سەردەمێك کارو باری ژیانی ئادەمیزادو باری شارستانێتی لە گۆڕاندایەو، لەو بارەیەوە دەلێ :ـ

**لازمە خول بخۆی وەکو بەرداش**

**هەموو قەرنێك دەگۆڕێ ئەمری مەعاش (٦٥)**

دەتوانم بلێم : ناوەرۆکی ئەم دێڕە شیعرەی حاجی قادر خۆی لە فەلسەفەی مەتریالیزمی مێژوویی‌یەوە نزیك دەکاتەوە ، دوور نی‌یە حاجی ئەمەی لە ئەنجامی خوێندنەوەی کتێبی‌تازەو بیستنی هەوالی جوولانەوە سیاسی‌یەکانی وولاتانی ئەورووپای لەلا گەلالە بووبێ کە هەر گەلەی بۆ یەکگرتنەوەی پارچەکانی وولاتەکەی خۆی یاخود بۆ چاك کردنی باری ژیانی چینە رەنجدەرەکانی تێدەکۆشا •

هەروەکو لە پێچ‌و لـۆچی شیعرەکانی حاجی بە باشـی هەست بـە تێکۆشانە نەتەوەیی‌یەکەی دەکەین‌و بەشێکی گەورەی لە شیعرە سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌یەکانی گرتۆتەوە ، دەبینین لـە هـەمان کاتدا دەست بۆ ئەو ڕاستی‌یەیەش درێژ دەکات « کە هەست کردنیەتی بە رەنـج خـوراویی نەتەوەی کوردو ، ئەیزانی کە چۆن بە شەوو بە رۆژ خەریکی ڕەنجدانە، کەچی بەری ڕەنجەکەی بۆ خـۆی نی‌یە ، بۆ داگیرکەرانی بێگـانەیە کە ئەو رۆژە عەجەم‌و تورکە عوسمانی‌یەکان بوون • گـوێت لێ بێ چۆن باسی ئەمەت بۆ دەکات‌و لە چرچ‌و لۆچی شیعرەکانیشیدا بلار دەگرێتـە ئەو داگیرکەرانەو »(٦٦) دەلێ :ـ

**حاصیلی ئێمە وەك دەکەم تەخمین**

**کرمی ئاوریشمین‌و مێش هەنگوین**

**نی‌یە ئارام‌و راحەتی‌و خەوتن**

**شەوو رۆژێ هەتا دروستی ئەکەن**

**کەچی رۆمی کە ئێمە دەیناسین**

**وا دەزانن کە ئێمە نەسناسین (٦٧)**

**یانە ئیرانی‌یەك کە مەعلوومە**

**دایکی ( موتعەیە ) باوکی مەوهوومە**

**ئەمە دەیکاتە کاسە دەینۆشێ**

**ئەو کەوای لێ‌دەکات‌و دەیپۆشێ (٦٨)**

حاجی مەسەلەی رەنجمژین‌و چەوساندنەوە بە چاوی چینـایەتی سەیر ناکات ، بەلکوو تێکرای نەتەوەی کورد بە چەوساوەی عوسمانلی‌و عەجەمەکان دادەنێ‌و هـەر دەیخاتـەوە ناو چوارچێـوەی تێکـۆشانی نەتەوایەتی کورد لە پێناوی یەکگرتنەوەی بەشە لێك‌دابڕاوەکانی ، وەك یەکگرتنەوەی ئەلەمانیاو ئیتالیا لە کیشوەری ئەوروپادا •

حاجی کوردپەروەر ، دیارە پاش خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەو بەراورد کردنەوەیەکی زۆر لە مێژووی ژیانی گەلان ، بە وردبوونەوە لە سەرچاوە زانیاری‌و پیشکەوتنخوازەکان ، نەك تەنیا دەست نیشانی ئەوەی کردووە ، ئەگەر خێڵەکانی کورد یەکتری نەگرن گەلی کورد سەرناکەوێ ، بەڵکو داوای سەربەستی‌و قەوارەیەکی نەتەوەیی بۆ کورد بە شێوەیەکی هاوچەرخانە کردووە (٦٩) • هەروەك لەم چەند دێڕە شیعرەیدا دەڵێ :ـ

**تا ڕێك نەکەون قەبیلی ئەکراد**
**هەروا دەبنە خەرابە ئاباد ،**
**ئەنواعی میلەل گەورە تا بچووك**
**خەملیوە مەمالیکی وەکوو بووك**
**یەك بەرگن‌و یەك زمان‌و یەك ڕەنگ**
**بێ غەیبەت‌و عەیب‌و عارو بێ دەنگ (٧٠)**

هەر بەو پێیە حاجی نەخشەی بۆ ئەو ڕۆژەی کورد کێشاوە کە هەموو گەورەو سەرکردەکانی لە هەموو بوارێکی ژیانـدا ببن بە یەك و یەك بگرن‌و هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیشی ببن بە یەك بەرگ‌و یەك زمان‌و یەك دەستوورو یەك ئایین واتا : « وەك خاوەنی بیرێکی تیژی ئاسۆ فراوان‌و چاوێکی دووربین ، ئێش‌و ئازارو گیروگرفت‌و دەردە سەری‌یەکانی نەتەوەکەی لە بەرچاو ئاشکرا بووەو ئاوات‌و خواستی پیرۆزی لە نیشتمانێکی یەکگرتووی نەتەوەیی(٧١) » لەژێر سایەی پێشەوایەکدا کێشاوە ، هەروەك لەم چەند دێڕە شیعرەی‌دا ئەوەمان بۆ دەردەبڕێ‌و دەڵێ :ـ

**هەموو گەورەی ویلایەت ببنە ئەحباب**
**وەکوو شەخسیکی واحید بن لە هەر باب**

**هەمووتان ببنە یەك تەعلیم‌و نووسین**
**وە یەك بەرگ‌و زمان‌و ڕەسم‌و ئایین (٧٢)**

خوێندەواری بەڕێز : ئەمە بوو لێکۆڵینەوەیەکی خێرا لەسەر بابەتی سەرهەڵدانی شیعری سیاسیی کوردی لە نێوانی ( خانی ) کە زۆربەی ژیانی لە سەدەی حەڤدەهەمدا بەسەر بردووەو لە سالی ١٧٠٦ دا کۆچی دوایی کردووەو ( حاجی قادری کۆیی ) کە بە لانی کەمەوە ( سەدو دەساڵ ) دوای مردنی خانی چاوی ژیانی هەڵێناوەو لە سالی ١٨٩٧ دا بە بێ کەسی لە شاری ئەستەمبۆل سەری ناوەتەوەو ، زۆربەی ماوەی ژیانی لەو شارە پڕهات‌و بات‌و زانست‌و رۆشنبیریی‌یە بەسەر بردووە «ئەستەمبوڵی ئەو ڕۆژەش جێگـای کۆبوونەوەی هـەموو ئازادی خـواکانی وولاتـانی عوسمانلی بوو ، لە کـوردو عارەب‌و ئەرمـەن‌و نەتەوەکـانی ئەوروپـای خواروی رۆژهەلات کە لەو سەردەمەدا لە تێکۆشـاندا بوون بۆ ئازادیی خۆیان یان تازە خۆیان لە دەستی عوسـمانلی‌یەکان رزگار کـردبوو • ئەستەمبۆڵی‌ئەو رۆژە دەیان کۆمەڵ‌و پارتی نهێنی لە هـەموو نەتەوەکانی تێدا بوو ، کە بۆ رزگارکردنی وولاتانی خۆیان ئیشیان دەکـرد • »(٧٣) بۆیە حـاجی شـاعیری رۆشـنبیریی نەتەوەی کـورد لە چاو شـاعیرە هاوچەرخەکانی زۆر بە پێش سـەردەمی خۆی کەوتبـووەو پێش‌بینیی گەلێ ڕووداوی کوردستان‌و جیهانی دەورو پشتی کردووەو لە دوایشدا بە ڕاست گەڕاون •

ئەو سەرەتاو ڕێچکەیەی « خانی » بۆ شیعری سـیاسی کوردی دانا دەبینین لە لای ( حاجی ) بـوو بـە ڕێبازێـکی پان‌و بـەرین‌و بـوو بـە قوتابخانەیێکی تازە لە شیعری کوردیداو ، گەلێ لە شـاعیرانی نیـوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هاتن‌و پەیڕەوی ئەو ڕێبازەی شیعری سـیاسیان کردو ، هەریەکەش بە پێی توانسـت‌و بەهرەی هـونەری‌و سـەردەمی

خۆی جۆرە پێشخستن و گۆڕانکاری یەکی خستە ناو فۆڕم و بیرو ناوەڕۆکی شیعری ئەو قوتابخانەیە •

★ ★ ★

پەراوێزو سەرچاوەکان :-


١ ـ د• جلال الخیاط وآخرون ـ تأریخ الادب العربی الحدیث ـ بغداد ١٩٧٩ ، ص ٤٣
٢ ـ د• عزالدین مصطفی رسـول ـ أحمدی خـانی شـاعرا ومفـكراً وفیلسوفاً ومتصوفاً بغداد ١٩٧٩ ص ٧٨
٣ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٨٨
٤ ـ صادق بەهائەدین ئامێـدی ـ دیوانـا مـەلایێ جزیـری ـ بـەغدا ١٩٧٧ ، ل ١٤٦
٥ ـ د• عزالدین مصطفی رسـول ـ أحمدی خـانی شـاعرا ومفـكراً وفیلسوفاً ومتصوفاً بغداد ١٩٧٩ ص ٨٩
٦ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٨٩
٧ ـ الملا احمد بن الملا محمد البهتی الزفنگی ـ العقد الجوهري في شرح دیوان الشیخ احمد الجزري ـ القامشلي ـ ١٩٥٨ ، ص ٨٢٤
٨ ـ د• عزالدین مصطفی رسـول ـ أحمدی خـانی شـاعرا ومفـكراً وفیلسوفاً ومتصوفاً بغداد ١٩٧٩ ص ٩٠
٩ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٨٠
١٠ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٩٠
١١ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٩٥
١٢ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٥٩
١٣ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٦١

١٤ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٩٥

١٥ ـ م • ب • رۆدنكۆ ـ مەمو زینی ئەحمدی خانی ـ مۆسكۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٢

١٦ ـ طاجیك : تاجیك : لێرەدا مەبەستی لە ( فارس ).

١٧ ـ د• عزالدین مصطفی رسول ـ أحمدی خانی ص ٩٦

١٨ ـ م • ب • رۆدنكۆ ـ مەمو زینی ئەحمدی خانی ـ مۆسكۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٣

١٩ ـ د• عزالدین مصطفی رسول ـ أحمدی خانی ص ٩٦

٢٠ ـ م • ب • رۆدنكۆ ـ مەمو زینی ئەحمدی خانی ـ مۆسكۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٣

٢١ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٢

٢٢ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٢

٢٣ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٣

٢٤ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٢

٢٥ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٢

٢٦ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٣ ، ٣٤

٢٧ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٤

٢٨ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣٤

٢٩ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣١

٣٠ ـ عەلائەدین سەجادی ـ مێژووی ئەدەبی کوردی چ ٢ بەغدا ١٩٧١ ، ل : ٢٥٣

٣١ ـ مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتیح عەبدولکەریم ـ دیوانی نالی ، بەغدا ١٩٧٦ ، ل : ١٠٦

٣٢ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی سالم چ ٢ ، هەولێر ١٩٧٢ ، ل : ١٠٠

٣٣ ـ عەلائەدین سەجادی ـ مێژووی ئەدەبی کوردی چ ٢ بەغدا ١٩٧١ ، ل : ٢٧٤
٣٤ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی سالم چ ٢ ، هەولێر ١٩٧٢ ، ل : ١٠٠
٣٥ ـ عەلی تاڵەبانی ـ دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی ـ بەغدا ١٩٤٦ : ل : ٣٤
٣٦ ـ د. مارف خەزنەدار ـ شیعری سیاسی کوردی لە کوردستانی عیراق ـ گوڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ـ ژمارە (١٥) بەغدا ١٩٧٢ ، ل : ٤٥
٣٧ ـ م . ب . رۆدنکۆ ـ مەمو زینی ئەحمەدی خانی ـ مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٣
٣٨ ـ ئەورەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ٥٠
٣٩ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ٤٩
٤٠ ـ م . ب . رۆدنکۆ ـ مەمو زینی ئەحمەدی خانی ـ مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٥
٤١ ـ ئەورەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ٩
٤٢ ـ م . ب . رۆدنکۆ ـ مەمو زینی ئەحمەدی خانی ـ مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ٣٣
٤٣ ـ د. مارف خەزنەدار ـ شیعری سیاسی کوردی لە کوردستانی عیراق ـ گوڤاری کۆلێجی ئەدەبیات ـ ژمارە (١٥) بەغدا ١٩٧٢ ، ل : ٤٥
٤٤ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ٩٥

٤٥ ـ سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٤٤
٤٦ ـ ئەوڕەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ٥٢
٤٧ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ١٢٩
٤٨ ـ م • ب • ڕۆدنکۆ ـ مەم و زینی ئەحمەدی خانی ـ مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ٣١ ، ٣٢
٤٩ ـ ئەوڕەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ١١
٥٠ـ دیوانی گۆران ـ ب ١ ، بەغدا ١٩٨٠ ، ل : ٣٤٠
٥١ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ٤٩
٥٢ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٤٤
٥٣ ـ ئەوڕەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ٣٧
٥٤ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٥٢
٥٥ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٥٦
٥٦ ـ مەسعوود محەمەد ـ حاجی قادری کۆیی ـ ب ١ بەغدا ١٩٧٣ ، ل : ٣١٥
٥٧ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٣١٥
٥٨ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ٤٥
٥٩ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ١٣٠
٦٠ ـ ئەوڕەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ١١

٦١ ـ هەمان سەرچاوە ، ل : ٥٢
٦٢ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ٥٠
٦٣ ـ د٠ جلال الخیاط وآخرون ـ تأریخ الادب العربی الحدیث ـ بغداد ١٩٧٩ ، ص ٤١
٦٤ ـ محەمەدی مەلا کەریم ـ حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ١٩٦٠ ، ل : ١٠
٦٥ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ٩٠
٦٦ ـ محەمەدی مەلا کەریم ـ حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ١٩٦٠ ، ل : ٥٧
٦٧ ـ نەسناس : جۆرە مەیموونێکە ٠
٦٨ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ١١٢
٦٩ ـ مومتاز حەیدەری ـ حاجی رۆشنبیری شۆڕشگێڕ ـ گوڤاری رۆشنبیر ، ژمارە (١) ساڵی ١٩٧٣ ، ل : ٢٢
٧٠ ـ ئەوڕەحمان سەعید ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ـ بەغدا ١٩٢٥ ، ل : ١١
٧١ ـ مومتاز حەیدەری ـ حاجی رۆشنبیری شۆڕشگێڕ ـ گوڤاری رۆشنبیر ، ژمارە (١) ساڵی ١٩٧٣ ، ل : ٢٣
٧٢ ـ گیوی موکریانی ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی چ ٣ ، هەولێر ١٩٦٩ ، ل : ١١٦
٧٣ ـ محەمەدی مەلا کەریم ـ حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ١٩٦٠ ، ل : ١٠

# بــێرکلێی

**شیعری : ناظم حیکمەت**
**شــوکور مستەفا**
**لە تورکی‌یەوە کردوویە بە کوردی**

هێی
بێرکلێی !
هێی مەترانە فەیلەسووفەکەی چەرخی هەژدەهەم !
بۆن بخووردەکەی فەلسەفە
بۆ سەرگێژکردنمانە
بۆئەوەیە لە شەڕی ژیاندا
لەسەر چۆك پەل‌کێش کرێین

هێی
بێرکلێی !
هێی لە کڵێشەی جبرائیلدا ئیزرائیلەکەی خودا
هێی پیاوکوژە هەرە فەیلەسووفەکەی چەرخی هەژدەهەم •
تا ئەمێستاکەیش ترپەی هەنگاوەکانت
لە گوندەکانی ئیسکۆچیا دەگەڕێ •
تا ئەمێستاکەیش سەگێکی کوڵك بەخوێن
بە ترپەی هەنگاوەکانت دەحەپێ •

تا ئەمێستاکەیش
همموو شەوێ گوندی‌یەکانی ئیسکۆچیا
سێبەرەکەت لە جامخانەی ماڵەکانیاندا
دەبینن‌و لەرزیان دێتێ !
تا ئەمێستاکەیش شوێنەواڕی هەر پێنج پەنجە خوێناوی‌یەکانت
بە ئێوارە سپی‌یە وەك بوزڵی جامەکانی باکوورەوە دیارە !

هێی
بێرکلێی !

جبەی ڕەش‌لەبەرە سەرچۆپی‌کێشەکەی کچانی مەیخانە،
شۆڕەسوارەکەی قڕاڵ
دەنگە زێڕینەکەی سەرمایەو
مەترانەکەی خودا !
بۆن بخووردەکەی فەلسەفە
بۆ سەرگێژکردنمانە
بۆ ئەوەیە لە شەڕی ژیاندا
لەسەر چۆك پەل‌کێش کرێین !

هەر وشەیەکت
کە مەچەکمان
کەلەپچە دەکا ،
دێڕە وەك
مار پێچ‌پێچەکانت
دەیانەوێ
بەدڵمانەوە بدەن •

وێنەکەت لە عیسایەکی خەنجەر بەبەرەوە دەچێ
ناوەکەت لە کتێبەکانتەوە تیژتیژ دیارە
هەروەك ددانێکی قەوزاویی
نووكتیژ کە
تك‌تك
خوێنی لێ بتکێ •
کام کتێبت دەگری
دەڵێی قەشەیەکی پشتێن دۆقی ڕەشە
لە بەردەم پەروەردگاردا چۆکی داداوە •••
تۆ بەم قیافەتەوە دەتویست لە خشتەمان بەری ،
یەبڕوامان بێنی ؟
خۆ ئێمە ڕەبەنێ نیین بە هەوبای وەسڵی عیساوە
سەر بنێینەوە !

هێی
بێر کلێی !
هۆ ڕێوی‌یەکەی شای ڕێوی‌یان !
کاتێکی دێرەکانت شەیپووری سەرکەوتن دەنگێون ،
بچووکترین پارچەی بەردێکی بچووکت ،
کە وەك ئیمپراتۆری ئیمپراتۆران ، لێ دێتەپێش
دەسبەجێ بۆ ڕێك کەوتن
دەرگا دەخەیە سەرپشت
سواری کۆڵی خوات دەبی
لە چەپەوە بۆی دەردەچی !
بۆی دەرمەچۆ ڕاوەستە !

هەموو ڕێیەك بۆ ڕۆما دەچێتەوە
ـ ئەمە ڕەنگە ڕاست بێ ـ
بەلام
ئەو فەلسەفەیەی کە بیری پێ یەکەم بێ ،
هەرێمی سەفسەتەیە ئەو جێی بایەوانی
لێ هەڵدەدا !
ئەمە ڕاستی‌یەکە
ـ لە چەشنی ڕەهاو موتڵەقەکەی ـ
ئەوە خۆت و ،
ئەوە فەلسەفەکەت !

تۆ بەو
مێوە بریقەدارە
خڕە
سوورە زردباوەی
کە پەنجە بە تۆیکڵە جەوهەردارەکەیدا دێنی ،
دەڵێی :
« ئامێتەیەکی بیر » .

پێ لەو هەیە نانێی
کە بە بێ ئێمە
هەیە !
ئەی ئەو دەریا شینە ،
ئەی ئەو گەمیە بایەوان سپی‌یەی بەسەر ئەو دەریا شینەوە
دەگەڕێ ؟
ئەوانە ، ئەو بیرانەن کە لەخۆتەوە بەبیرتدا دێن ؟

مادامێکی ئەو گەمیەی بەسەر دەریاوە دەگەڕێ بیری خۆتە ،
مادامێکی عوممان بیری خۆتە ،
نە زەمان هەبێ و
نە مەکـان ؟ !
نە لە تۆ بەدەر هیچ هەبێو
نە بەر لە تۆ شتێ بووبێ ،
نە لەپاش تۆ کەونو کائینات باقین
کەواتا هەر خۆتو
خودا حەقیقین .
بەڵام هۆ هۆ قەشە سەرخۆشەکەی مەیخانە ڕەشو بۆرەکان !
ئەی ئەوەی کە بەدانسقە کیژی مەیخانەچی‌یەکەت بە مەچەکو باهووی کۆڵکنەوە
هەڵدەگوشی ، ئـەو شـۆخە
لە تۆ بەدەر نەبوو ؟
یانەکو خۆت
بەسەر خۆتدا تسیت ؟
با بڵێین باوکی مبارەکەت نەبووە ،
وەکـو عیسـا .
باشە ئەی دایکێکی وەك مرێمیشت نیە
کە لە ناوگەڵیەوە هاتبیتەدەر ؟
با بڵێین تۆ تاكو تەنیای
وەك مووسا لە تووری سینا ،
بەداخەوە ! کەسیش نین تەوراتەکەت بخوێننەوە ؟
زۆرت درۆ کردووە زۆر .

تۆ دڵنیابە بێرکلێی ،
ـ نەشبی قەیناکاو زیانی نیە ـ
ئەوەی لە نووسینێدا بەرتدەکەوێ :
نەختێ تەوس‌و گاڵتە
کەمێ جەفەنگ
یەك دوو شەقازللەی مزر
ـ ئەویش لە جۆری بێدەسەوانەو دەسکێش ـ
چبکەم ؟
نەشئە مۆسیقای شەڕو خەباتە
ئەوەی ئاهەنگی پۆلایینی نەشئە نەبیێ
لەو پیاوە دەچێ
گوڕو توانی لە شەڕدا نەختێ
دابێتیەکزی .
نەشئە ... شتی چاکەو وەسسەلام .
ـ ئەگەر پیاو تووشی سەرەخولێ نەکا . ـ
جا هینەکانی ئێمە
پێکەنین ؟
بڕ بەدەم پێدەکەنن ؟
خەتا لە گوڕو توانی وانە :
دەنا نە خەتای تۆیەو
نە خەتای من !
گوێگرە بێرکلێی !
ـ گوێیش نەگری هەر دەبێ ـ
با ئێمە گوێگرین :

مێشکمان دووبەرەیەکە
هەنگوین هەڵدێنێ •
ئەو هەنگەی بڕیدەکا لە هەنگوین
ژیانــە •
کانیی ئەو هەستو بیرە
قووڵو بێپایانەی
لێوەی هەڵدەگۆزین
کائیناتــە !
کائینات بەربڵاوو هەراو ،
کائینات قووڵ ،
کائینات بێپایان !
ئێمە پارچەی ئەوین ،
ئێمە بڕێ بێبەلوێی لەو گووراوین !
ئێمە لە بابەتی ئەو بێبەلوێیانەین
ــ کە لە دایکی خۆیان لاری نین ــ
چونکە ئێمە !
لەو فەرماندەرانە نین کە فەرمان بە فەرماندەران دەدەن !
بەشانو باهووە وەك گوریسی چواربادو پێنجبادەوە
بە زەوییەوە بەستراوین !
کاتێکی چەرخدارە بە برووسکە ، ددان پۆلاکان
نهێنیو پەنامی زەویی ڕەش دەپچڕن ،
وەرە بڕوانە
سەیرو سەفای لەدایكبوونی
جیهانان لە جیهان

لەبەر ڕووناکیی کاکێشانان !
دیتمـانو
دەبینیـن
کچانی لێو قەدیفەی ئاڵ
بە ڕێگای ڕۆژگارەوە
چۆن بوون بە خاك
ئەوەی لەپاش قژە سوورمەیی یەکانی
ئەستێرە کلکدارەکانەوە بەجێ دەمێنێ
بە ئاسمانی بێ سنوورەوە
ڕێڕەوی بزاوتمان
لە بەرچاو دەکێشێ
هەر دەنکێ گومەزێکی لەخۆدا وەشێردووە
ئەو دەریایانە ،
هاژەی ئەو بایانەی کە وەك دەریا
بەسەر دەریاکانەوە دەشنێنەوە
ئەو ئاوەی کە دلۆپەکانی
وەك ملوانکەیەکی مرواریی ڕشتە پچڕاو
دەدلۆپێ و ،
تا دوورکەویتەوە ، نزیك دەکەویتەوە
ڕاستی دەشارێتەوە ....
هەر شوێنێکی دەگری
بە دەریای عوممانیشەوە ،
ئیمکانێکی نرت و نوێ .
کائینات بەربلاوو هەراو

کائینات قـووڵ ،
کائینات بێ‌پایان !

هێی
بێر کلێی !
هۆ هۆ جووجکە بستە باڵاکە
بەم ڕێوەلەیی‌یەی خۆتەوە
هێشتا تۆ ئینکاری چیاکانی کوروات دەکەی !
ئەگەر تەشریفت بۆ ئەو دنیا برد
لەوێوە بەردێ بنێرە
بۆ ڕازاندنەوەی کوتەڵاکەکەی خوداکەت !
بەڵام خێرا
تاس‌و شانەت بپێچەوە لێرە .
هەڕاج مەزات !
هەڕاج مەزات !
بیبانبە لە بازاڕ بیانفرۆشە بە پوولێکی قەڵب
تەختە بەرەو حەایحەلەی ئاسمان هەڵچووەکەی
سەڵتەنەتی سەرزەوی ،
لە سەرووی خۆکردەوەو
لە خۆکرد بەدەر هێزێکی‌دی نیە ! ....
خۆکرد بەربلاو
خۆکرد بەرین
خۆکرد بێ‌پایان !

# مووڕووی ماڵاوسێ مەگەر بە شەو بکرێنە مل

**د. ئەورەحمانی حاجی مارف**

نووسین دەستکەوتێکی مەزنی ئادەمیزادەو پەیدابوونی سەرەتـــای مێژووی شارستانەتی‌یە . نووسین لە ژیانی گەلانو تێکڕای کۆمەڵو هەر یەك لە ئەندامانیدا دەورێکی گەورەی بینیوەو دەبینێو کارێـکی زۆری تێ‌کردووەو تێ‌دەکا . لەبەرئەوە لێکۆڵینەوە لە سەرەتاو مێژوو ، ڕێبازو شێواز ، پێـکهاتنو کارکـردن ، ناتـەواویو کۆسـپ ، پێشـکەوتنو گەشەکردن...ی نووسین کارێکی مەزنو پێویستو بەسوودە . لـــەم ڕێگەیەوە دەتوانرێ چارەسەری گەلێك کێشەی گرنگ بکرێ . بێ‌گومان نووسینی کوردی کە هێشتا زۆر سەری پڕە لە پاشاگەردانی ، چاوەنواڕی لێکۆڵینەوەی قووڵو تێرو تەسەلە ، چاوەچاوی باسێکیەتی کە لە گشـت ڕوویەکی بدوێو بە بیرو باوەڕی ڕاستو زانستانە گیروگرفتەکانی لە ڕێ لابدا ...

وەك ئاشـکرایە ، ڕووناکبیرانـی کـورد هەمیشـە لەبـەردەم گیروگرفتەکانی نووسینی کوردیدا تووشی چەندین قۆرتو تەگەرە بوونو دەبن . ئەمڕۆش کە کێشەی نووسینی کوردی بووەتـە باسی باسـان ، وەنەبێ هۆکەی هەر ئەوە بێ کە مامۆستایان لە گرانیی وتنەوەی گلەیی‌یانەو قوتابیان لە سەرلێ‌دەرنەکردنی ماندوو بوونو نووسەرانو ڕۆژنامەنووسان بە کێشەی هەمەجۆریەوە گیریان خواردووە . بەڵکو ئەوەشە کە مەسەلەی چۆنیەتیی نووسینی هەر زمانێك لە پلەی یەکەمی کێشەکانی زمانەوانیـدا

دێت • بێتو ئەمڕۆ بۆ هەر کێشەیەکی زمانی کوردی کۆڕی لێکۆڵینەوە بەستریٚ ، ڕەنگە بەهەڵەدا نەچم ئەگەر بڵێم چ لەلایەن زانایانەوەو چ لەلایەن ڕووناکبیرانەوە باسی ڕێنووس پتر بایەخی پیٚ دەدرێت • ئەوەتە دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراق هەر کە بانگەوازی سازکردنی کۆڕێکی بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بڵاوکردەوە (١) ، ئەوەندەی پیٚنەچوو چەندین باس‌و لێکۆڵینەوە گەیشتە بارەگای کۆڕ ••• وابزانم مامۆستایەك یان قوتابی‌یەك ، نووسەرێك یان ڕووناکبیرێك نییە چاوەڕوانی‌و ئاواتی ڕزگاربوون لە کۆسپ‌و گیروگرفتەکانی ڕێنووس لە چاویدا نەدرەوشێتەوە •

لە زانستی زماندا سەبارەت بە ڕێنووس پرسیارێك دێتە گۆڕیٚ : کیمیاو فیزیازانستن ـ بەڵام ئەی ڕێنووس ؟

ئەگەر لەبەر ڕووناکیی ئەو پێناسانەی لە گەلێك کتێب‌و فەرهەنگدا بۆ ( زانست ) دانراون ، لە ( ڕێنووس ) یان بە واتایەکی تەواوتر ، لە ( تیۆری ڕێنووس ) وردبینەوە ، بۆمان دەردەکەویٚ ڕێنووس بەشێکە لە زانستی زمان ، هەروەك چۆن ئەتۆم بەشێکە لە زانستی فیزیا ••• چۆن لە هەر زانستێکدا ئەرکی دۆزینەوەو گەشەپێدان‌و چەسپاندنی شت لە ئەستۆی زانایان‌و پسپۆراندایە ، هەر بەوچەشنە ڕێنووسیش کاری زمانەوانانە •••

لە بەراوردکردنی ڕێنووس لەگەڵ زانستی‌تردا ، ئەوە بەدیار دەکەویٚ کە ڕێنووس خاوەنی تایبەتی‌یەتێکی خودی‌یە • ئەو

---

(١) بانگەوازێك لە دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقەوە ( کۆڕێك بۆ گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ) ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق » ( دەستەی کورد ) ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٩٦ ـ ٢٩٨ •

تایبەتی‌یەتی‌یەش لەوەدایە کە هەموو کەسێکی خوێندەوار ، واتە هەر کەسێك بیەوێ بنووسێ – پێویستی بە زانینی دەستوورەکانی ڕێنووس هەیە ، چونکە هەر لە سەرەتای دەست‌کردنەوە بە خوێندن تا کۆتایی ژیان دەنووسێ‌و دەخوێنێتەوە ••• کەچی هەر شتێکی نوێ لە هەر زانستێکدا کە دەدۆزرێتەوە ، ئەگەرچی کەڵکی بۆ سەرپاکی ئادەمیزادیش هەبێ ، ڕەنگە زووربەی خەڵك بەکاری‌نەهێنن ، یاخود ئەگەر بەکاریشی‌بێنن بێ‌بیرکردنەوە بەکاری‌بێنن • بەوێنە یەکێك کە مەکینەی ڕیش‌تاشینی کارەبا یان ئوتووی کارەبا بەکاردێنێ ، دەشێ هیچ لە یاساکانی فیزیا نەزانێ ، یاخود ئەگەر بیشیزانێ شتێکی کەمی لێ بزانێ ••• کەچی تەنانەت بۆ نووسینی شتی سەرەتاییش ، پێویستە هیچ نەبێ دەستوورە سەرەکییەکانی ڕێنووس بزانێ – واتە بێ‌شارەزایی ڕێنووس ، خوێندنەوەو نووسین کارناکەن‌و خوێندەوار کاتێك کەڵك لە نووسین وەردەگرێ کە سەر لە دەستوورە سەرەکییەکانی دەرکات • جا چالاکیی بەکارهێنان ئەو تایبەتی‌یەتەیە کە ڕێنووس لە زانستی‌تر جیادەکاتەوە • دیارە هەر ئەو تایبەتی‌یەتەشە بووەو دەبێ بەهۆی سازکردنی‌موناقەشەی گەرم لە باسی هەر کێشەیەکی ڕێنووسدا •

بەڵام وەك چۆن ڕاکێشانی تەلی کارەباو چاککردنەوەی ، شارەزایی باش لە واقیعی یاساکانی فیزیا ناگەیەنێ ، هەر بەوچەشنە پەیداکردنی ئاشنایەتی لە دەستوورەکانی ڕێنووسیش نیشانەی باش چوونە ناو ئەو زانستە نییە •

ڕێنووس بریتی‌یە لە کۆمەڵێك دەستوور کە بە هاریکاری ئەوانەوە ئاخاوتنی ئێمە دەنووسرێ • ئەوەی دەنووسێ ئەگەر لە دەستوور لابدا ، هەڵەی ڕێنووس دەکات • ئەو جۆرە هەڵانەش کۆسپ دێننە ڕێگەی

خوێندنەوەی تێکست • ئەو کۆسپانەش سەرنجی خوێنــەر لە تێگەیشتنی ناوەرۆك کەمدەکەنەوە •

ڕێنووسی هەر زمانێکیش یاساو دەستووری تایبەتی خۆی هەیە ، کە لەسەر بناغەی دیاری‌کراو دامەزراوە • بەوێنە ڕێنووسی زمانی کوردی لەسەر ڕێبازی فۆنەتیکی سازکــراوە ؛ لــە ڕێنــووسی زمانــی ڕووسیدا ڕێبازی فۆنەتیکی‌و مۆرفۆلۆژی کاریگەرن (٢) ؛ ڕێنــووسی ئینــگلیزی‌و فەرەنسی پەیڕەوی ڕێبازی چاولێ‌کەری دەکــەن ، کە هۆی نووســینی گەلێك وشە بەو شێوەیەی ئێستا ، وا ڕوون‌دەکەنەوە گوایا باوو باپیرانیان بەوجۆرە نووسیویانە (٣) •••

هەر ڕێنووسێك بەزۆری ، ڕەنگی تایبەتی‌یەتەکانی ئــەو زمانــە دەداتەوە کە ڕێنووسەکەی بۆ دانراوە (٤) • جا بۆیە ئاسان نییە ڕێنوسی زمانێك بەسەر زمانێکی دیدا دابڕڕێ ، هەر وەك چۆن جلی یەکێك پڕ بە بەری یەکێکی‌تر نییە • بۆیــە لە لێکۆڵینــەوەو دەستکاری کردنــی ڕێنووسدا پێویستە تایبەتێتی‌و یاساکانی ئەو زمانە بە باشی ڕەچاو بکرێن •• بەشێــك لەو وتارانــەی بــۆ کــۆڕی گــیروگرفــتی ڕێنــووسی کوردی نووسراون (٥) خاسیەتی زمانی کوردیــان بــاش تێــدا خوێندراوەتەوەو بەشێکیشیان بەئاشکرا کاری زمانی بێگانەیان پێوە دیارە • بەشێکیان لەســەر

---

(٢) ب • ز • بوکچینا ؛ ل • پ • کەلاکۆتسکایا ؛ ل• ك• چیلتسۆڤا ، نامە دەربارەی ڕێنووس ، مۆسکۆ ، ١٩٦٩ ، ل ٣٧ •

(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٣٧ •

(٤) دیارە ئەو ڕێنووسانە نەبێ ، کە پەیڕەوی ڕێبــازی چاولێ‌کەری دەکەن •

(٥) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق » ( دەستەی کورد ) ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ •

بناغەی زانستی نووسراون‌و کێشەی ئاڵۆزی جۆربەجۆریان ڕەواندۆتەوەو ئەنجامی سەرکەوتوویان وەدیهێناوە ، بەڵام بەشێکی تریان لاوازو سادەو ساکارن •• لەگەڵ جیاوازی ڕادەی وتارەکانـدا پێویستە ئـەو ڕاستی‌یە لەیادنەکەین کە هەر نووسەرە ( جگە لە د• کامیل بەسیر ) بەپێی توانست‌و زانینی ، هەوڵی‌داوەو خۆی ماندووکردووە ••• کەچی هەرچی د• کامیل بەسیرە ، کە ئەندامێکی دیارو بەرزو چالاکی دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقە ، بە خشکەیی زانیاری لە کتێبێکی حەفتا ساڵ لەمەوبـەر چاپکراوی عەرەبی‌یەوە • ـ « الترقيم وعلاماته في اللغة العربية » (٦) ، بێ‌ئەوەی ناوی بەرێ ، وەرگرتووەو کردوویەتی‌یە کوردی‌و بـە ناوی « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی »یەوە بڵاوی کردۆتەوە (٧) •

لەنێو هەموو ئەندامانی دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقـدا تەنیا د• کامیـل بەشـداری وتارنووسیـنی کـردووە • لەنـێو تێـکڕای وتارنووساندا تەنیا د• کامیل ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری عێراقە • لـە بڵاوکردنەوەی باسەکاندا بایەخی زۆر بەوەی ئەو دراوەو لەبەر پایەبەرزی لە ڕیزی هەرە پێشەوە بۆی دانراوە ••• بەڵام سەیرو سەمەرە ئەوەیـە کە تەنیا هەر ئەو ڕێگەی چەوت‌و چەوێڵێ دژ بە زانستی گرتووەو بـە ناڕەوایی‌و دەستبەسەرداگرتـن‌و ڕەنجی خەڵـك کردنە موڵـکی خۆو شاردنەوەی ڕاستی کاری خۆی مەیسەر کردووە •

★ ★ ★

لەئەنجامی وردبوونەوەدا لە مێژووی نووسینی کوردی ، ئەوەمان لێ ئاشکرا دەبێ ، کە دەمێ ساڵە نووسەرانی کورد کێشەی چۆنیەتـــی

---

(٦) احمد زكي باشا ، الترقيم وعلاماتـه في اللغة العـربية ، مصر ، ١٩١٢ •

(٧) د• کامیل بەسیر ، خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤـاری کۆڕی زانیاری عێراق » ( دەستەی کـورد ) ، ب ٩ ، بەغـدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥ ــ ١٥ •

نووسینی زمانەکەیان لە بەرچاو گرتــووەو دەیــان وتــارو لێکۆڵینەوەیان لەبارەی ( گیروگرفتی نیگاری دەنگەکان )و ( گیروگرفتی نووســینی وشــەکانو تێك بەستنیــان )ەوە (٨) نووســیوەو هەوڵــی نەهێشــتنی گیروگرفتەکانیان داوە تا لە پاشاگەردانی ڕزگاریان بێ‌و ئەلفوبێی عەرەبی وا لێ بکەن بتوانرێ دەنگە کوردییەکانی بە جۆرێکی وا بێ دەربڕڕێ ، خوێندەواری کورد بتوانێ ئەوەی دەیلێ بیخاتە سەر کاغەز •

بەڵام بەداخەوە ، هەرچی کێشەی ( خاڵبەندی )یــە کاری زۆری تێدا نەکراوەو هەوڵی باشی بۆ نەدراوە• ئەوەی لەو ڕووەوە بڵاوکراوەتەوە هێندە کەمە بە پەنجە دەژمێررێ• کاری هەرە دیاری ئەم مەیدانە بریتی‌یە لەو چەند لاپەڕەیەی مامۆستا تۆفیق وەهبی ، کە لە کتێبی « قواعد اللغة الكــرديــة » ( ١٩٥٦ ) دا نــووســـيوێتی‌و (٩) ئــەوەی مامۆســـتا ئــەمینی عەڤــدال لە لاپــەڕە ( ٤٣ ـ ٥٣ ) ی کتێبی « خــەبەزنامــا کوردییا ڕاستنڤیساندنە » ( ١٩٥٨ )دا بە ناوی ( نقتك دانين )ەوە (١٠) بڵاوی کردۆتەوە (١١)و ئەوەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین ساڵی ١٩٦٦ لە

---

(٨) بڕوانە : د• ئەورەحمانی حاجی مارف ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیــاری عێــراق » ( دەستەی کورد ) ، ب ٨ ، بەغدا ؛ ١٩٨١ ل ٦٦ ـ ١٢٠ •

(٩) توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، الباب الثاني ، بيروت ، ١٩٥٦ •

(١٠) ئەمینی عەڤدال ، خەبەرناما کوردییا ڕاستنڤیســاندنە ، یەریڤــان ، ١٩٥٨ •

(١١) مامۆستا شوکور مستەفا ئەو چەند لاپەڕەیەی کتێبی « خەبەرناما کوردییا ڕاستنڤیساندنە » ی ، کە بەناوی ( نقتك دانين ) ەوەیە ، لەئەلفوبێی سلاڤی‌یەوە هێناوەتە ســەر ئەلفــوبێی عــەرەبی‌و لــە « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ( بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٠٣ ـ ٣١٨ ) دا بڵاوی کردۆتەوە •

بەشی دەیەمی کتێبی « ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی »دا لێی‌دواوە (١٢)•••
لەم‌ڕۆژانەشدا باسێکی نوێ بڵاوکرایەوە ، ئەویش گوایە وتاری د• کامیل بەسیرە ، کە بۆ کۆڕی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی نووسیوە(١٣)•

ئەگەرچی مامۆستا تۆفیق وەهبی‌و مامۆستا ئەمینی عەڤدال‌و مامۆستا نووری عەلی ئەمین خاوەنی بڕوانامەی دوکتۆری نین‌و بەرهەمەکانیشیان ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر نووسیوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، لە هەموو ڕوویەکەوە لەو باسە بەناو نوێیەی د• کامیل بەسیر زانستی‌یانەترو قووڵترو لەبارترن، ئەویش لەبەر ئەوەی کەرەستەی وتاری « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی » سەرەڕای ئەوەی لە کتێبێکی کۆنەوە دەرهێنراوە ، هەروەها باسی خاڵبەندیی عەرەبی‌یە ، نەك کوردی • جا هەر بۆیەش چاومان بە چەندین هەڵەی زەق‌و ناتەواویی گەورەو شێواندنی ڕاستی سەرسووڕهێن دەکەوێ تێیدا •

د• کامیل لە کۆتایی وتارەکەیدا ناوی پێنج سەرچاوە ـ سیانی کوردی‌و دوانی عەرەبی‌ـی بردووە ، کە گوایا بۆ نووسینی باسەکەی کەڵکی لێ وەرگرتوون • بەڵێ گلەیی ئەوە لە دوکتۆر ناکرێ ، کە سەرچاوە کوردییەکانی تەنیا سێ کارن ، چونکە دەربارەی خاڵبەندیی کوردی بەرهەمی هەرە دیار ئەوانەن • بەڵام جێی لۆمەیە کە تەنیا ناوی دوو سەرچاوەی عەرەبی بردووە (١٤) • جا نەك هەر د• کامیلی پسپۆڕی ناسراوی زمانی عەرەبی ، بەڵکو کۆلکە خوێندەوارێکیش ئەوە دەزانێ کە لەبارەی ڕینۆسی عەرەبی‌یەوە دەیان کتێب‌و وتارو لێکۆڵینەوە هەیە •••

---

(١٢) نووری عەلی ئەمین ، ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٦ ، ل ٩١ ـ ٩٩ •

(١٣) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، د• کامیل بەسیر ، خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی •

(١٤) ئەو دوو سەرچاوەیەش ئەمانەن :
« الاملاء الواضح : عبدالمجيد النعيمي ودحام الكيالي ، چاپی دووەم

بەداخەوە هەموو بەڵگەیەك وادەگەیەنێ کە بەکارهێنان یان ناوبردنی تەنیا دوو سەرچاوەی عەرەبی ، نیشانەی ئەوەیە کە :

١ ـ نووسەر خۆی بە لێکۆڵینەوەو نووسینی باسەکەیەوە ماندوو نەکردووەو ویستوویەتی بە هەر چەشنێك بێت بەشداری کۆڕی ناوبراو بکات •

٢ ـ د• کامیل ویستوویەتی ئەو بیروڕایانەی لە عەرەبی‌یەوە کردوونی بە کوردی بکاتە مولکی خۆیو بە ناونەبردنی سەرچاوەکەی خوێنەر چاوبەست بکات •

بۆ بەڵگەی ئەم وتانەشم تەنیا ئەوە بەسە پەنجەیەك بۆ کتێبی « الترقيم وعلاماته في اللغة العربية»ی(١٥) مامۆستا ئەحمەد زەکی پاشا ڕابکێشم، کە د• کامیل ناوی نەبردووە بەڵام زوربەی زۆری لەو وەرکرتووە • بۆئەوەی ، ئەمە وەك قسەی ڕووت نەبێ ، چەند شوێنێکی هەردوو نووسین بەرانبەر یەك دادەنێمو با خوێنەریش بەراوردیان بکات :

---

١٣٨٥ ك ١٩٦٦ ز چاپخانەی ( ئەسعەد ) • بەغداد •

الاملاء : الدکتور احمد ناجی القیسی ، عبدالجبار عبدالله الآلوسی ، عبدالجبار کاظم العاشور ، عبدالکریم عبدالمجید الجعفري، غازي جاسم محمد العنبکي چاپی یەکەم • ١٣٩٩ ك ـ ١٩٧٩ ز چاپخانەی سلمی الفنية الحديثة » ( وتاری ناوبراو ، ل ١٥ ) •
د• کامیل لە نووسینەوەی ئەو دوو سەرچاوەیەدا هەموو دەستووروێکی خاڵبەندی تێكو پێكداوە• بەڕاستی سەیرو سەمەرەیە، یەکێك لەبارەی خاڵبەندی‌یەوە وتار بنووسێ کەچی تەنانەت سەر لەو نیشانە ئاسانانەش دەرنەکات ، کە بۆ تۆمارکردنی سەرچاوە پێویستن

(١٥) سەرچاوەی ناوبراو ، احمد زکي باشا ، الترقيم وعلاماته في اللغة العربيـة •

## مامۆستا ئەحمەد زەکی نووسیویتی :

★ « الكلام ثلاثة اقسام : اسم ، وفعل ، وحرف »
( ل ١٨ ) •

★ « طلب بعض الملوك كاتبا لخدمته • فقال للملك :
اصحبك على ثلاث خلال » •

ـ ما هي ؟

ـ لا تهتك لي سترا ، ولا تشتم لي عرضا ولا
تقبل في قول قائل •

ـ هذه لك عندي • فما لي عندك ؟

ـ لا افشي لك سراً • ولا أوخر عنك نصيحة ، ولا
أوثر عليك احدا •

ـ نعم الصاحب المستصحب ، انت ! » • ( ل ٢٧ )

## د • کامیل دەڵێ :

« ئاخاوتن سێ پارچەیە : ناو ، فرمان ، ئامراز » •
( ل ٧ )

« پادشایەك پێویستی بە نووسەرێك هەبوو بۆ هەڵسوڕاندنی ئیش‌وکارەکانی ، نووسەرەکە بە پادشاکەی ووت :

ـ بە سێ مەرج لەگەڵتدا ئیش ئەکەم •

ـ ئەم سێ مەرجە چین ؟

ـ حورمەتم مەشکێنە ، دەست بەڕوومەوە مەنێ ، بە بووختانی دووژمنەکانم بڕوامەکە •
باشە بەم سێ مەرجە ڕازیم، بەڵام من داوای چیت لێ دەکەم ؟

ـ هەرگیزاو هەرگیز نهێنی‌یەکانت نادرکێنم‌و لە ئامۆژگاری کردنت دریغی ناکەم‌و هیچ کەسێك بەلامەوە لە تۆ خۆشەویست‌تر نابێت »• ( ل ١١ )

★ « وعظ اعرابي ابناً له ، أفسد ماله في الشرب ، فقال : لا الدهر يعظك ، ولا الايام تنذرك • والساعات تعد عليك • والانفاس تعد منك • وأحب أمريك اليك اردهما للمضرة عليك » • ( ل ٢٢ )

« پیاوێکی ژیر ئامۆژگاری کوڕێکی کرد کە پارەکانی بۆ رابواردن لە کیسی خۆی دابوو ، پێی ووت :
نە گەردون سەرزەنشتت دەکاتو نە ڕۆژگار ووشیارت دەکاتەوە • ساتەکانی ژیانت دەستنیشان کراون • هەناسەکانیشت لە کاتێکی تایبەتیدا کۆتاییان دێت • دوو حاڵەتت لە بەرچاودایە باشترینیان ئەو حاڵەتەیە کە زیانت پێدەگەیەنێ » • ( ل ٦ – ٧ ) •

★ « بين جمل الشرط والجزاء ، أو بين القسم وجوابه » ( ل ١٨ )

« لەنێوانی ڕستەی مەرجو دەربڕینی سوێند پێخواردنو وەڵامەکانیاندا •» ( ل ٧ )

★ « علامة الانفعال ! وتوضع في آخر كل جملة تدل على تأثر قائلها وتهيج شعوره ووجدانه ، مثل الاحوال التى يكون فيها التعجب والاستغراب والاستنكار والاغراء والتحذير والتأسف والدعاء ونحو ذلك»• ( ل ٢٥ )

« (!) نیشانەی هەڵچوون : ئەم نیشانەیە لە کۆتایی هەموو ڕستەیەکدا سازدەکرێت کە بێژەرەکەی تووشی هەڵچوونێك بووبێتو لە هەستو نەستیدا سۆزێك بەرپا بووبێت • وەکو : حاڵەتی دەربڕینی سەرسوڕمانو

| | |
|---|---|
| | هەڕەشەکردنو ئارەزوو بزواندنو خەفەتو خۆشیو یارمەتی داواکردنو دوعاو سکالاّکردنو ڕازی نەبوون•» (٩ – ١٠) |
| ★ « ویکون بسکوت المتکلم أو القارئ سکوتاً تاما مع استراحة للتنفس » ( ل ٢٢ ) | «••• کە خوێنەر چاوی پێدەکەوێ بەتەواوی لە خوێندنەوەکەی ڕادەوەستێت بۆئەوەی بحەسێتەوەو هەناسە بدات • » ( ل ٦ ) |
| ★ « هذا الوقوف یکون بسکوت المتکلم او القارئ سکوتاً قلیلا جدا ، لا یحسن معه التنفس » • ( ل ٢٠ ) | « خوێنەر کە ئەم نیشانەیە دەبینێ ، بۆ ماوەیەکی کەم لە خوێندنەوەکەی ڕادەوەستێتو هەناسە نادات » • ( ل ٧ ) |
| ★ ویکون بسکوت المتکلم أو القارئ سکوتاً یجوز معه التنفس « ( ل ٢٠ ) <br> •••• و گەلێکی تر •• | « خوێنەر بەمنیشانەیە تاوە ڕاوەستانێك دەست لە خوێندنەوە هەڵدەگرێتو بۆی هەیە هەناسە بدات • » ( ل ٨ ) |

هەرچەندە بەشێکی کەم لەو نموونەو ڕستە عەرەبی‌یانە لە کوردیشدا هەن ، بەڵام ئەگەر مەسەلە لێ‌وەرگرتن نەبێ ، چۆن وا ڕێکەوتووە لە هەردوو بەرهەمی ناوبراودا ( کە یەکەمیان بە عەرەبی‌یەو دەربارەی خاڵبەندیی عەرەبی‌یەو حەفتا ساڵ لەمەوبەر چاپکراوەو دووەمیان بە کوردی‌یەو گوایا لە بارەی خاڵبەندیی کوردی‌یەوەیەو ئەمڕۆ هاتۆتە دنیاوە ) لە هەمان شوێنداو بۆ هەمان مەبەست هێنراونەتەوەو نووسراون •
سەرەڕای ئەوەش زۆربەی زۆری نموونەو ڕستەکانی بەئاشکرا نەبوونی ڕەنگ‌و بۆنی کوردییان پێوە دیارە •جا بۆیە ئەگەر کارەکەی د• کامیل لەگەڵ ئەوەی مامۆستا ئەحمەد زەکی‌یشدا بەراورد نەکرێ ، ئەوە شێوەی ناباری هەر جاڕی ناڕەسەنیی لێ‌دەدات •

ئەگەر بمانەوێ درێژە بە باسەکەمان نەدەین‌و لەو هەموو نموونە لەبارەو گەلێکی‌دی گەڕێین‌و تەنیا بکەوینە بەرانبەر یەک‌گرتنی باسی نیشانەی ( : دوو خاڵ ) لە هەردوو نووسراودا ، ئەوە بەتەواوی ئاشکرا دەبێ کە د• کامیل زۆری وتارەکەی لە کارەکەی مامۆستا ئەحمەد زەکی‌یەوە وەرگرتووەو وەری گێڕاوەتە سەر کوردی :

١ ـ دیاری کردنی شوێنی بەکارهێنانی نیشانەی دوو خاڵ لە هەردوو بەرهەمدا بەتەواوی وەك یەکن‌و هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا نییە ( بڕوانە : ل ٢٦ی کتێبی « الترقيم وعلاماته في اللغة العربية ) و ل ٨ ـ ٩ی وتاری « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی » ) •

لەبارەی ئەو وێکچوونەوە دوو تێبینیم هەیە :

یەك ـ د• کامیل نەدەبوو وا توونـد زمانی کـوردی بـە عەرەبی‌یەوە بەستێتەوە ، بەڵکو پێویست بوو حیسابێك بۆ زمانی زگماکی بکات‌و هیچ نەبێ کەمیك خـۆی بـە دۆزینـەوەی تایبەتێتی بەکارهێنانی نیشانەی دوو خاڵەوە لە کوردیـدا مانـدوو بکات •

دوو ـ دوکتۆر کە لە کتێبی مامۆستا ئەحمەد زەکی پاشاوە دەقـی تەواوی باسی شوێـنی بەکارهێنانـی نیشانەی دوو خاڵـــی وەرگرتووە ، ئیتر نەك هەر دەبوو وەك سەرچاوە نـاوی بەرێ ، بەڵکوو پێویست‌بوو ئەنـدازەی لێ‌وەرگرتنەکەش بخاتە پێش چاو •

٢ ـ مامۆستا ئەحمەد زەکـی چوار نموونەی بـۆ بەڵـگەی باسی شوێنی بەکارهێنانی نیشانەی دوو خاڵ هێناوەتـەوەو د• کامیـل سیانیانـــی کردۆتە کوردی • وا دەردەکەوێ ئـەو تاکە نموونەیەش کـــە نەیکردۆتە کوردی بەهۆی گرانیی وەرگێڕانیەوە بووبێت •

ئەوەش سێ نموونەکە :

لە لاپەڕە ( ٢٦)ی کتێبەکەی مامۆستا ئەحمەد زەکـی‌دا نووسراوە

★ روى عن النبي ( صلى الله عليه وسلم ) « اذا لم تستح فاصنع ما شئت » •

★ تنقسم الدنيا الى خمسة اقسام : افريقية ، واسيا ، واوروپة ، والاقيانوسية •

★ العقل ، والصحة ، العلم ، والمال ، والبنون : تلك هي النعم التي لا يحصى شكرها •

د• کامیل لە لاپەڕە (٩)دا وتوویە :

★ پێغەمبەر ( د • خ ) فەرموویەتی : ئەگەر شەرم ناکەیت ؛ هەرچیت ئەوێ بیکە •

★ لە جیهاندا شەش ووشکانی هەیە : ئاسیاو ئەفریقیاو ئەوروپاو ئەسترالیاو ئەمەریکای ژووروووو ئەمریکای خواروو •

★ ژیری‌و تەندروستی‌و زانست : ئەو پاداشتانەن کە هەرگیزاو هەرگیز سوودەکانیان نابڕێتەوە •

ئەوەتە وەك ڕۆژی ڕوون دیارە ، کە د• کامیل ئەو نموونانەی لە کتێبی ناوبراوی مامۆستا ئەحمەد زەکی پاشاوە وەرگرتووەو کردوونی‌یەتە کوردی ••• ئەگەر کاکی دوکتۆر بیەوێ وا نیشانبدا کە شوێنی بەکارهێنانی دوو خاڵ لە عەرەبی‌و کوردیدا وەك یەکن‌و ئەگەر وەرگرتن‌و ناونەبردن بەلایەوە کارێکی خراپ نەبێ ••• خۆ دەبوو هێندە بزانێ کە بۆ بەڵگەی پێ‌سەلماندنی دەستوورێکی کوردی ڕستەی وەرگێڕراو لە عەرەبی‌یەوە کارێکی زۆر نابەجێ‌یە ••• تێ‌ناگەم د• کامیل لە سەرەتای

زمانەوانی بێ ئاگایە یان واتێ دەگا خوێنەری کورد لە گوێی گادا نووستووە ؟ •••

وێڕای هەموو ئەمانە ، لە وەرگرتن و وەرگێڕانی ئەو سێ نموونە عەرەبی یەدا هەندێ شتی سەیر سەرنج ڕادەکێشن ، بەوێنە :

١ - گومانم نییە د• کامیل دەیان فەرموودەی پێغەمبەر ( د • خ ) دەزانێ ، کەچی هەر ئەوەی کردۆتە کوردی، کە مامۆستا ئەحمەد زەکی پاشا هێناویەتی یەوە • دیارە یان ئەوەندە ناشی یە نەیتوانیوە فەرموودەیەکی دیی لە جێ دانێ ، یان نەیویستووە تەنانەت بۆ تاوێکیش بیری خۆی بخاتە گەڕو ڕەنگە وابزانێ هەرچی بڵێ و بنووسێ ئەوپەڕی زانستە •

٢ - لەبەرئەوەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ( د •خ ) دەقێکی وەرگێراوە ، مامۆستا ئەحمەد زەکی پاشا خستوویەتی یە نێوان ( کەواتەی دووتایی )یەوە • کەچی د• کامیل کە لای خۆی دەیەوێ خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی سازبکات و لای خۆی لە باسی ( کەوانەی دووتایی )دا ئەوەی وتووە ، کە ئەم نیشانەیە بۆ خستنەڕووی دەقی وەرگیراو بەکاردەهێنرێ ( بڕوانە : ل ١٢) ، ئەوەندە ناشی یە کە فەرموودەکەی وەرگێڕاوە کەوانەی دووتایی بۆ دانەناوە•• بەڕاستی د• کامیل نەدەبوو لە مەیدانێکدا کە هێندە تێیدا کۆڵ و بێ ئاگا بێ ، لەپێناوی خۆدەرخستندا خاڵبەندیی کوردی بەو دەردە بەرێ •

٣ - نەك ئەندامێکی گەورەی کۆڕی زانیاری ، بەڵکو کۆڵکە خوێندەوارێکیش ، ئەگەر خۆی ماندوو بکا لە زمانی شیرینی کوردیدا هەزاران نموونە بۆ بەکارهێنانی دووخاڵ دەدۆزێتەوە •

٤ ـ د. كامیل وای‌زانیوه ئەگەر هەندێ وشەی نموونەکان پاش‌وپێش بخات یاخود شتێکیان بخاتە سەر یاخود شتێکیان لێ لابدات ئیتر ناناسرێنەوە . بەوێنە مامۆستا ئەحمەد زەکی کە باسی وشکانی‌یەکانی جیهان دەکات لەپێشدا ناوی ( ئەفەریقیا ) دەباو ئنجا ( ئاسیا ) ، بەڵام د. کامیل ( ئاسیا )ی خستۆتە پێش ( ئەفریقیا )وە ... نووسەری کتێبی « الترقیم وعلاماته في اللغة العربیة » لە جیهاندا پێنج وشکانی دیاری کردووە ، هەرچی نووسەری وتاری « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی »یە وشکانی‌یەکانی جیهانی بە شەش داناوە ... لە دوا نموونەدا د. کامیل وشەکانی ( المال )و ( البنون )ی نەکردووەتە کوردی ...

...و هەندێکی‌تر .

ئەگەر ئەو سەرچاوەیەی د. کامیل بە بێ‌دەنگی‌و بەبێ‌ناوهێنان زانیاری‌و کەرەستەی لێ‌دەرهێناوە ، کتێبێکی نامۆ بوایە ، ئەو دەم شی‌کردنەوەی وتارەکەی زۆری ماندوو دەکردم ، چونکە نەك هەر لاپەڕەو نەك هەر باسێکی ، بەڵکو هەموو دێڕێکی جێی ڕەخنەیە . جا ئێستا بە پێویستی نازانم لە ناتەواوی‌و هەڵەی ئەو وتارە بدوێم ، ئەویش لەبەرئەوەی بیروڕاکانم دەبنە هەڵسەنگاندنی کتێبی « الترقیم وعلاماته في اللغة العربیة » ، نەك وتاری « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی » . لە سەرێکی تریشەوە دەبێ لێکۆڵینەوەیەکی سەرلەبەر لەبارەی ( خاڵبەندی )یەوە بنووسم .

پێشتر بە چەندین نموونەو بەڵگە ئەوەمان ئاشکرا کرد کە کاری د. کامیل هەر وەرگرتن‌و وەرگێڕان بووە. جا بۆئەوەش بەیەکجاری گومان نەمێنێ کە دوکتۆر هیچی لەبارەی خاڵبەندیی کوردییەوە نەکردووە،

تەنیا خستنە پێش چاوی یەکەم دێڕی وتارەکەی بەسە ، کە دەڵێ : « ( خاڵبەندی ) واتە : ( علامات الترقیم ) » ( ل ٥ ) • دەبینین ( خاڵبەندی )و ( علامات الترقیم )ی خستووەتە نێوان دوو کەوانەوەو دوای وشەی ( واتە )ش دوو خاڵی داناوە • جا سەیرو سەمەرە ئەوەیە :

١ ـ لە باسی بەکارهێنانی نیشانەی دووکەوانەدا چوار حاڵەتی دیاری کردووە ( پێشتر نیشانمان‌دا کە لەکوێوە کردوونی‌یەتە کوردی )، کەچی هیچ حاڵەتێکیان ئەوە ناگرێتە خۆی کە نووسەر خۆی لە یەکەم دێڕی وتارەکەیدا بەکاری‌هێناوە •

٢ ـ دەربارەی نیشانەی ( دوو خاڵ )یش ئەوەی وتوویەتی بە هیچ جۆرێك حاڵەتی دانانی دوای وشەی ( واتە )ی تێدا نییە •

د• کامیل کە لە دێڕی یەکەمی وتارەکەیدا ( خاڵبەندی )و ( علامات الترقیم )ی خستووەتە نێو دوو کەوانەوەو دوای وشەی ( واتە )ش کە دوو خاڵی داناوە ، دیارە بەلایەوە ڕاست وایە لەو شوێنانەدا پێویستە ئەو نیشانانە دابنرێن ••• جا ئەگەر نووسەر پەلەی بووبێ‌و فریانەکەوتبێ ئاوڕێك لە نووسینی کوردی بداتەوە ، خۆ هیچ‌نەبێ دەبوو سەیرێکی شێوەی نووسینەکەی خۆی بکاو لەگەڵ ئەوەی‌وەری گێڕاوە بەراوردیان بکات‌و بزانێ لەگەڵ یەك دەگونجێن یان نا •••

جا بۆیە سەیر نی‌یە کاری شازدەساڵێك لەمەوبەری مامۆستایەکی پلەی سەرەتایی وەك نووری عەلی ئەمین کە لە دە بەش پێکهاتووەو تەنیا بەشێکی دەربارەی خاڵبەندی‌یە،لە بەرهەمی ئەمڕۆی دوکتۆرێکی گەورەو پسپۆڕێکی زمان‌و ئەندامێکی دیاری کۆڕی زانیاری ••• کە تایبەت بە

خاڵبەندی یەو بۆ کۆڕێکی زانستی ئامادەکراوە کە ئەو گیروگرفتانەی تێدا چارەسەر بکرێ ، باشترو بەرفراوانتر بێت بەوێنە مامۆستا نووری عەلی ئەمین بۆ شوێنی بەکارهێنانی نیشانەی کۆماو دە حاڵەتی دەستنیشان کردووە ، کەچی د. کامیل تەنیا باسی چوار حاڵەتی کردووە . باسی نیشانەی پرسیار لە کتێبی «ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی»دا یازدە دێرە ، بەڵام لە وتاری « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی »دا چوار دێرە ....

باسی ئەو لێکۆڵینەوە ئەکادیمیانە ناکەم کە لەبارەی خاڵبەندیی زمانی ڕووسی یەوە نووسراون ، بەڵکو تەنها ناوی ڕابەرێك دەبەم کە ڤ. ف. ئیڤانۆڤا ساڵی ١٩٦٢ بە ناوی « سەرەتایێکی خاڵبەندیی ڕووسیی »یەوە بڵاوی کردۆتەوە (١٦) . ئەم ڕابەرە کە بۆ قوتابیانە (٦٦) لاپەڕەی خەتی وردی ڕووسی یە . جا ئەگەر ئەو نووسینەی د. کامیل بەری ڕەنجی خۆشی بوایە ، هەر کەس پێی ڕازی نەدەبوو ، چونکە لە هەموان ئاشکرایە ، کە کێشەی پڕکێشەی خاڵبەندیی کوردی بە یازدە لاپەڕەی شاش توێژاڵی سەرەوەشی چارەسەر ناکرێ .

ئەگەر د. کامیل ئەو نموونانەی کتێبی « الترقیم وعلاماته في اللغة الكردية »یشی نەکردایەتە کوردی‌و لە جێیان نموونەی لە زمانی کوردی یەوە بهێنایەتەوە ، کارەکەی هەر ڕەخنەی زۆری لەسەر هەڵدەستا ، چونکە ئەگەرچی کورد نیشانەکانی خاڵبەندیی عەرەبی بەکاردێنێ‌و لەڕووی شێوەوە یەکن ، ئەمە واناگەیەنێ کە دەبێ شوێنی بەکارهێنانیشیان هەر وەك یەك بێ . دیارە د. کامیل لە مەسەلەی

---

(١٦) ڤ. ف. ئیڤانۆڤا ، سەرەتایێکی خاڵبەندیی ڕووسی ( ڕابەرێ بۆ قوتابیان ) ، زانکۆی لێنینگراد ، ١٩٦٢ .

زمانەوانیدا هێندە ساکارە، تەنانەت نازانێ کە هەر زمانە خاوەنی تایبەتیتی خۆیەتی • واتێدەگا ئەگەر کورد نیشانەکانی خاڵبەندیی عەرەبی بەکارهێنا، ئەوە دەبێ لەو شوێنانەشدا دایانبنێ کە عەرەب لە نووسینی عەرەبیدا دایاندەنێ ••• بەڵێ ئەو کە هێندە بێئاگا بێ، ئیتر لەکوێوە بزانێ شێوازە جۆربەجۆرەکانی بەکارهێنانی نیشانەکانی خاڵبەندی کامانەن‌و چ شێوازێك لەگەڵ سروشت‌و هەڵکەوتی زمانی کوردیدا دەگونجێ • نەك هەر دە کامیل، بەڵکو تەنانەت سەرچاوەکەشی تەنیا ئاگاداری شێوازی دەربڕینی گوتەیەو باسەکەی لەسەر ئەو شێوازە لاوازە دامەزراندووە •

باش دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی‌و چاك زانینی دەستووری بەکارهێنانی، کارێکی پێویست‌و گرنگە لە هەر نووسینێکدا •

( خاڵبەندی ) لەگەڵ ( نووسینی وشەکان ) ڕووی هەرە گرنگی داڕشتنی نووسینن • باش دانانی نیشانەکانی خاڵبەندی لە شوێنی پێویستداو ڕاست نووسینی وشەکان یاریدەی زوو تێگەیشتنی خوێنەر دەدەن •

زانینی بەکارهێنانی نیشانەکانی خاڵبەندی پێویستی بە ئەندازەیەك زانیاری هەیە • بۆ ئەوەی نووسەر بتوانێ بە ڕەوانی نیشانەکانی خاڵبەندی بەکاربێنێ‌و بزانێ لە شوێنی خۆیاندا دایانبنێ، دەبێ باش شارەزای سروشت‌و خاسیەت‌و ئەرك‌و دەوریان بێت •

نیشانەکانی خاڵبەندی لە نووسیندا بۆ دابەش‌کردنی تێکست لەڕووی سینتاکس‌و واتاوە بەکاردەهێنرێن • با بزانین مەبەست لە دابەش‌کردنی تێکست لە ڕووی سینتاکس‌و واتاوە چی‌یە :

وتار، نامیلکە، کتێب دەتوانن بەسەر بەش یان فەسڵ یان بەند یان ڕستە یان پارچەکانی ڕستەدا دابەش ببن•لە نووسیندا ئەرکی دابەش‌کردنی تێکست بەسەر ڕستەداو ڕستەش بەسەر پارچەی جیاوازدا، ئەو نیشانانە بەجێی‌دێنن، کە بە ناوی نیشانەکانی خاڵبەندی‌یەوە ناسراون •

بێ گومان ، ڕاست نییە وا بەفراوانی بووترێ ، کە گوایا نیشانەکانی خاڵبەندی تێکست بەسەر ڕستەدا دابەش دەکەن ، چونکە ئاخاوتنی ئێمە خۆی لەخۆیدا بریتی‌یە لە ڕستەو ڕستەش وەسیلەی پێکهێنو سازکەری زمانە • هەرچی نیشانەکانی خاڵبەندی‌یە تەنیا وەسیلەیەکی یاریدەدەرە بۆ نیشاندانی سنووری نێوان ڕستەو پارچەکانی ڕستە لە نووسیندا • لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین کەوا نیشانەکانی خاڵبەندی دیاری‌کردنی ئەو سنوورانە بە تەواوی ئاسان دەکەن (١٧) •

جاری‌وا هەیە بەهۆی لەبیرکردن یاخود ڕاست دانەنانی نیشانەیەکەوە ، سەرپاکی واتای ئەوەی وتراوە دەشێوێ • بەوێنە ئەو ڕووداوە زۆر ئاشکرایە، کە ساڵی ١٨٦٤ لە ئەمەریکا کاتی لەچاپدانی ئیستیمارەی گومرگ ، چەند خاوەن کارگەیەکی ئینگلیز بۆیان هەڵکەوت ڕاستکەرەوەکانی واشنتۆن بکرن بۆ ئەو مەبەستەی لە ئیستیمارەکاندا شوێنی ڕاستەقینەی کۆماوێك بگۆڕن • بەهۆی ئەو جێ‌گۆڕینەی کۆماوەکەوە ئەندازەی باجی پلیتە ئاسن وەك باجی ئاسنی خاوی لێ هات• ئەو هەڵەی چاپە ( ڕاستتر ئەو فێڵە ) تەنیا دوای حەڤدە ساڵ هەستی پێ‌کرا • ئەمەریکا لەوماوەیەدا لە دەستکەوتی باجی گومرگدا ٧٦٦ ٩٥٥ر٤٩ دۆلاری لەکیس چوو (١٨) •

لە ڕووی شێوەی دەربڕینەوە دوو جۆر دابەش‌کردنی وتە هەیە : دابەش‌کردنی وتەی ئاخاوتن‌و دابەش‌کردنی وتەی نووسراو • ئەم دوو دابەش‌کردنەش وێك‌ناچن‌و تەنیا لەنێوانیاندا یەك‌گرتنەوەیەکی دیاری‌کراو هەیە •

---

(١٧) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ڤ• ف• ئیڤانوڤا ، سەرەتاییکی خاڵبەندیی ڕووسی ، ل ٤ ــ ٥ •

(١٨) گۆڤاری « ئۆگۆنیۆك » ، ژ ٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ •

ئاخاوتن خاوەنی تایبەتێتی ڕاوەستانە لەنێوان بەدەمداهاتنی وشەکاندا ( بێ گومان نەك دوای هەموو وشەیەك ) • / ئێمە کاتێ دەدوێین ، بۆ دیاری کردنی مەبەست وشەکان لە گروپدا پێکەوە دەبەستین و لەنێوان گروپەکاندا کەم یان زۆر ڕادەوەستین • بەوێنە کە دەڵێین : ( کوڕە هەژارێك/ لە بازاڕی گەورە/ سواڵی دەکرد ) ، ئەوە ئەم ڕستەیە لە تەلەفوز کردندا بەسەر سێ گروپی واتادا دابەش دەبێ • پێویستە پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشین گروپی واتادار کە لە زانستی زماندا ( Syntagma ) ی پێدەڵێن، دەلوێ لە یەك وشە پێکهاتبێ، وەك : ( بێ گومان/ئەو خاوەنی سۆزە) ؛ (بەڵێ/تۆم خۆشدەوێ ) • یاخود دەشێ ڕستەیەکی سەرلەبەر بریتی بێ لە یەك سینتاکمە ، بەوێنە : ( ڕزگاریی کوردو کوردستانم دەوێ ) •••

جۆرەکەی دی دابەش کردن ، دابەش کردنی نووسینە • لێرەدا شێوازی دابەش کردن بە چەشنێکی ترە • لە نووسیندا بە نیگار گروپەکان جیادەکرێنەوە ، نەك بە ئاوازی دەربڕین • ئەگەرچی ئەمیش هەر پارچەی واتاداری ئاخاوتنمانن ، بەڵام دابەش کردنیان لەسەر بناغەی پێکهاتنی ڕێزمانی ڕستە دامەزراوە (١٩) •

نیشانەکانی خاڵبەندی لە دەستووری نووسینی کوردیدا بۆ دەستنیشان کردنی شوێنی ڕاوەستان نین • لە بناغەی خاڵبەندیماندا پێکهاتنی ڕێزمانی سەرەکی یە • نیشانەکانی خاڵبەندی هەروەها دەتوانن مەبەستی دی بگەیەنن، ئەویش بەتایبەتی نیشاندانی واتای گوتەیە•بەوێنە نیشانەی پرسیار واتای پرسیاری ڕستە دەستنیشان دەکا •

---

(١٩) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، ف• ف• ئیڤانۆڤا ، سەرەتاییەکی خاڵبەندیی ڕووسی ، ل ٩ •

له هەندێ باردا نیشانەکانی خاڵبەندی پێوەندیی واتـایی لە نێـوان پارچەکانی گوتەدا دەستنیشان دەکەن • بەوێنە :

١- من قیژاندم ، ئەوان ڕایانکرد • ( لە گێرانەوەی باسـەکەدا ژماردنی ڕووداو ڕەچاوکراوە ) •

٢- من قیژاندم ـ ئەوان ڕایانکرد• ( ئەوان ڕایانکرد، چونکە من قیژاندم ) •

٣- من قیژاندم : ئەوان ڕایـانکرد • ( من قیژانـدم ، چونکـە ئەوان ڕایانکرد ) •

بەوچەشـنە نیشـانەکانی خاڵبەنـدی بـەر لە هـەرشـت دەوری دابەش‌کردنی تێکست بەسەر ڕسـتەدا لەڕووی واتـاوە دەبینن • وێڕای ئەوە ، هەروەها دەتوانن واتای گوتە دەستنیشان بکەن ، یان پێوەنـدیی پارچەکانی گوتە دیاری‌بکەن • لەکۆتاییشـدا حاڵـەتیوا هەیـە ، کـە نیشانەکانی خاڵبەندی بۆ دیاری‌کردنی ئاوازی گوتە بەکاردەهێنرێ •

لەبەرئەوەی مامۆستا ئەحمەد زەکی پاشا باش بـەلای ئەو ڕێبـازو شێوازەی نیشانەکانی خاڵبەندی‌دا نەچووە ، بۆیە د• کامیلیش وا ساکار باسی ئەو نیشانانە دەکات ••• ئەگەر لەڕووی تیۆرییەوە لە باسەکەی دوکتۆر بگەڕێین‌و تەنیا تەماشا بکـەین لە تێکسـتی وتارەکەیـدا چـۆن نیشانەکانی خاڵبەندی داناوە ، ئەوە یەکسەر بۆمان دەردەکەوێ کە ئێجگار نەشارەزایانە بەکاری‌هێناون(٢٠) • بەڕاستی جێی داخـە وتارێـکی ئـەم ڕۆژانە کە سەبارەت بە خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردییەو نووسەرەکەی

---

(٢٠) هەڵەی بەکارهێنان‌و شوێنی دانانی نیشانەکانی خاڵبەنـدی لـە تێکستی وتاری ناوبراودا هێندە زۆرە کە بەداخەوە لێرەدا جێیان نابێتەوە •

کەسێکی ناودارە بە هیچ چەشنێك بۆ خوێنی چێشتیش بەلای دەستووری نووسینی زمانی کوردیدا نەچووەو لە دەیان شوێنی نالەباردا نیشانەی نادروست قوت کراوەتەوە ، کەچی ڕۆژنامەیەکی کوردی وەك « تێگەیشتنی ڕاستی » (٢١) ، کە پتر لە شەست ساڵ لەمەوبەر بە سەرپەرشتی کابرایەکی بێگانە ، لە بارو دۆخێکی تایبەتیدا بڵاوکراوەتەوە ، تایبەتێتی زمانی کوردی باش تێدا خوێندراوەتەوەو بە زۆری هەر نیشانەیەك لە هەر شوێنێکدا دانراوە زانایانە مامەڵەی لەگەڵ کراوە (٢٢) •

جا خوێنەر کە بەرگی نۆیەمی گۆڤاری کۆڕ دەکاتەوەو یەکەم وتار — « خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی » — دەبینێ ، ناهەقی نیە بە پایەی بەرزی د• کامیل و جێگەی تەرخان کراوی تایبەتی بۆ وتارەکەی هەڵخەڵەتێ • بەوپێیە ، خوێنەر چاوەڕوانی ئەوە دەکا لە مەیدانی پان و بەرینی خاڵبەندیی کوردیدا لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی قووڵ بخوێنێتەوەو لە ڕێگەیەوە کەڵك وەربگرێ بۆ وەلاوەنانی ئەو گیروگرفتانەی لە نووسیندا بەرەنگاری دەبن ••• بەڵام بەداخەوە ، دوای خوێندنەوەی یەك دوو لاپەڕە هیوای نامێنێ و لەگەڵ بەردەوامییشدا تووشی ڕەشبینی دەبێ ••• بەڵێ د• کامیل بەم باسەی نەك هەر سوودی نەبەخشیوە ، بەڵکو زیانێکی گەورەشی بە زمانی شیرینی کوردیو نووسینی پیرۆزی کوردی گەیاندووە •

---

(٢١) بۆ وەرگرتنی زانیاریی تەواو لەبارەی ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » یەوە ، بڕوانە : د• کەمال مەزهەر ، « تێگەیشتنی ڕاستی » و شوێنی لە ڕۆژنامە نووسی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ •

(٢٢) دەربارەی ڕێنووسی ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی » باسێکی تایبەتیم هەیە ، هیوادارم بەمزووانە بیخەمە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز •

بەڕاستی لە هــەموو ڕوویــەکەوە ئــەم کارەی د• کامیــل هەڵس و کەوتێکی ئێجگار نالەبارو نابەجێ و ناپەسەندەو تا بڵێی جێی داخ و لۆمــەو گلەیی و سەرزەنشتە ••• کەسێکی وا پسپۆڕ پێویستبوو بزانێ چــی دەکاو چی دەڵێ و چی دەنووسێ و توانستی بەسەر چیــدا دەشــکێ ••• وێڕای ئەوەش ، نەدەبوو هێندە لە بەرزەوە بڕوانێ و خوێنەری کورد بە ساویلکەو خەوتوو بزانێ •••

بێ گومان لێکۆڵینەوەی کێشەیەکی سەختی وەك خاڵبەندی بۆ کەسێکی وەك د• کامیل دژوارە • ئەو کە تائێستا جیاوازی لەنێوان پیتی واوی درێژو واوی کورتدا نەکات (٢٣) ، ئیتر دەبێ لە بــواری خاڵبەندیدا چەنــد ساکار بێ •

---

(٢٣) بەوێنە ، وشەی « گەردوون » کە واوەکەی درێژە ، بە یەك واوی نووســیوە ( بڕوانــە : ل ٧ ) ، کەچی وشــەکانی « دوژمــن ، بوختان » کە واوەکانیان کورتە بە دوو واوی نووسیون ( بڕوانە: ل ١١ ) • وابزانم زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم ، قوتابی خوێندنی سەرەتایی ئەمە دەزانێ ••

# ئەزو ناڤکورد سترانەکا نی

دوکتور نافع ئاکرەیی

ئەڤ هوزانە ل سەر کێش و هونینا سترانێت فولوکلورێ کوردی یا هاتیە ڤەهاندن ••• هەروەسا ئاوێنا وان رۆژانە کو ل دەشتا ناڤکورێ من دخوند لای مەلاو فەقی بوم ••• هیندەك ناڤ یێت تێدا هاتین هەمی ناڤێت پالەوانێت سترانێت ڤیانا فولوکلوری نە یان ژی ناڤێت گوندێت هەرێما ناڤکورێ نە : وەك : مەم و زین ، خەجول و سیامەند ، لاڤکێ دەشتانی ، مەحەمەدێ ناڤکوری ،کولکێ سولەیمین، گێنج خەلیل ، و هتد •••

گومل و خازر : هەر دو روبارن ل هەرێما ناڤکورێ ناڤێت گوندا: روڤیی ، جویجەر ، پیربۆب ، چرە ، زیناڤا ، گربەدەو ، تل جومر و هتد •••

حەسەن و حەمو : دۆ برانە دبێژن هەر ئەڤە بینە هەموو ئەو ستران و لاڤژێت هەرێما ناڤکورێدا تێنە گوتن • یێت دروستکرین ج سترانێت مێژوویی یان ژی ڤیان •

## (( شــيعرەکە ))

### ( ١ )

ئەزێ ب دەشتا ناڤ‌کورێدا بێم‌و ب خڕە بەرە
گول‌و تەیرا لێ کرە گری
مشك‌و مارا خوشی ل بەرە
هندی دکەم‌و ناکەم خوشتەڤیا من
ئەز ناپینم ••• دیار نی‌یە ••• یا بەزرە
هەناسە قوت‌بو ••• هندی چاڤا دگێرم
نە مەم ل بەر پەزی‌یە ••• نە زین دیارە
نزا بۆچی ••• گەردەن زەرا لاڤکێ دەشتانی
یا پڕخەمە ••• رەشی ل بەرە •

### ( ٢ )

ئەزێ ب دەشتا ناڤ‌کورێدا بێم‌و یا ب بی‌یە
رەهێن دارو درەختا جرمسین
رەنگێ مێرگ‌و گولا بەزرە بی یە
بلبلێ دنالیت بۆ رەنگێ گولا
پەپولە ل رەخێ شەمالێت د گەرێت
نزانیت مرن هەیە
کوچە بەرو خێزێ چەما دکەنە گازی
کولکێ سولەیمین •• بریندارە
حەکیم‌و لوقمان د دویرن
شیرینا وی دیــار نی‌یە

## ( ٣ )

ئەزێ ب دەشتا ناڤ‌کورێ‌دا بێم‌و دلێ منێ ب گازە گازە
هەڤال‌و هۆگر ل من بەزرە بوون
پێشی ئەز بێم ئەو چون تازە
دکەنە هەوار د بێ واریادا
قورینگ‌و شالیل‌و قازە
قەلا دمدم یا وێران‌بی
چیچک ڕەڤین ••• کوتر فڕین
بلبلێ رەبەن بێ لاوازە
عەلیکێ بەتێ یێ بێ پەرە
هندی دکەم‌و ناکەم ناکەت غارو ناکەت بازە •

## ( ٤ )

ئەزێ ب قەلاتا روڤێ‌ی‌دا بیم‌و
تا پیربوب و چرە و زیناڤا
دلێ پڕ خەم ••• نابینیت چۆ دەراڤا •
گێنج خەلیلێ پر ئازار بی
بۆ بنەڤشێ نەبۆ زاڤا
روژا ئەڤی بۆ وان مێرگا
نائینیت چۆ سلاڤا
هەیڤا جوان ماچا کانیا
یا ژ بیر کری ل ڤان گاڤا

هندی دکەمو ناکەم ••• فەرهادی ببینم ••
ل ڤان چیا نەقشا چێکەت ••
بەلێ چ بکەم
ئەو یێ سل بی ••• پڕ گری یی
صور دکەت چاڤا
حەسەنو حەمو یێ ل مە لال بین
قەد ناڤەکەن هەر دوو لێڤا •

( ٥ )

ئەزێ ب هەر دوو جۆیجەرادا بێمو بەر ل سەر بەری
خەجوکێ پرچا خۆ شەکر
ل بەر نەینکێ ••• یا رونیشتی
جاغو بسکو کەزی ••• وێ ڤەهینان
پورو پەچەم خەناکری
دەست هاڤێتە جەرەو گوسکا
رێکا سەر گوملو خازرا گرتە بەری
بەلکو سیامەندی د رێکی ببینیت
ب هەر دوو رویا ، ب کەتە کەنی
ب هەر دوو چاڤا ب کەتە گری
بەلێ هەی ئامانو ئەمان جانێ
گولێت گەنمی ••• دوریخێت برنجا ••• کرە گازی •••
ها خەجوکێ ••• مال خراپێ ••• خۆ دین نەکە
ئەڤە ل مێژە سیامەند نەمای

رێکا وی بۆ پر کوسپەو دڕی
ها ها خەجێ ... کەچا خوهی
دێ دەستی پاڤێژە بنە گوهی
قیرکە سترانێت خەمێ
دونیا نەما ب بێ دالەهی
چونکە ل مە چون خوشێت دوینێ
خەمێت ئەڤرو یێ د زیدەبین
تزا سوبەی دێ هەر دوەبین
تاری و تالیا دێ ئەم ڤەجین
یان ژی خەجێ جارەکادی ...
وەکی خەلکی ... ئەم ژی دێ هێنە بەر دەری .

## ( ٦ )

ئەزێ ب تلجومرو گربەدەوادا بیمو رێز ب رێزن
خەمو خەیالێت مەحەمەدێ ناڤکوری د دلیدا د لەیزن
بابەلیسکا خۆ لێك داڤە
دیتنا چاڤا ل مەگرتەڤە
کوزێت بەرخا ... گوتانێت پەزی
گوڤێت چێلا ... تەویلێت دەوارا
ل مە ڤالا بوون
بەرێت کۆچکا .. بێ کادیو بێ خولی بوون
جوتك و کاریتە ل هەمی مالا دوو پارچە بوون
جلکێت جانا پر رەشی بوون

ئەو چەتویَ سواریَ ئەسپی
ل غاریَدا ئەسپ لوکومی ... بیَ هیڤی ما
هندی دکەمو ناکەم
هاوارا خزما گەلەك دویرە
سواریَت جانی ماهینا گەلەك د دویرن
گەلەك ... گەلەك د دویرن قەد ناگەهن
گریو فیغان پشکا مەبین
نزا بۆچی و هەتا کەنگی ئەم دیَت وەبین ..

**فەرهەنگۆك :-**

ئەڤی : خوشەویست
بسكو جاغ : ئەو پارچەقژەن کە لە هەر دو لای رومەتی ژن دیَنە خوار
بابەلیسك : گەردەلوول
پورو پەرچەم : ئەو پرچەیە کە لە سەر نیَوچاوانی کچو ژن ئارایشت دەکریَ
تەویَلە : جیگای پشودانو نوستنی هیَسترو کەرو ئەسپە .
دەراڤ : ماوە : بوار
سل : تورە
ڤەجین : کاویَژدەکەین
ڤالا : بەتال ، خالی
کادی : دۆکیَل
کاریتەو جوتك : ئەو دارە دریَژو کورتانەن کە بۆ دروستکردنی سەربان بە کاردیَن

کوز : جێگای پشودان و نوستنی بەرخ
کۆتان : جێگای پشودانو نوستنی مەر
گوسك : کوزە
گوف : جیگای پشودانو نوستنی گاو چێل
لەپیزن : سەما دەکەن
لوکومی : ساتمەیکرد
نەینك : ئاوێنە

---

ئەوەی بۆئەوە لەدایكبووە لەسەر سك ،
بخشێ ، هەرگیز ناتوانێ بفڕێ •

ـ گۆرکی ـ

---

## پاشماوەی : ئەم ژمارەیەی تریش ••

دەبینین کە زۆر لەوانەی ئامادەن بە سەدان‌و هەزاران دینار بەو یانانــــە ببەخشن کە بــۆ کاتــی بەتاڵــی بردنــە ســەرو ئاهەنــگ‌و خــواردنەوە تەرخانکراون بەڵام بەخەیاڵیاندا نەهاتووە بزانن یەکێتی‌یەك هەیە ، هەموو نووسەرانی کورد ئەندامی ئەو یەکێتی‌یەن‌و گۆڤارێکیشی هەیە یارمەتی‌ی ئەوانی بێ ناخۆش نەدەبوو • هەر لێرەشــدا باسی زۆر لــە بیرڕووناك‌و خوێندەوارەکانمان دێتەوە یاد ، کە لە زۆر شوێن‌و موناسەبەتدا دەیانبینین، بەڵام ڕۆژێك بەگوێگریش بێت لە کۆڕێکی ئەدەبی‌ی یەکێتیدا نەماندین‌و لای هەندێکیش ئەگەر کلاویان بکەوێتە بارەگای یەکێتی یا لقەکانی‌یەوە بەگۆچان دەری‌دەهێننەوە •

با لەم سکالایەش بگەڕێین‌و بێینەوە سەر ئەم ژمارەیە •

ئەمیش وەك ئەوانی‌تر ، هەڵبژاردە نی‌یە ، بەڵام هەرە باشی ئــەو بەرهەمانەی تێدایە کە لامانن • دیارە ئەگەر لەوە باشتریشتان بوێت ، ڕەنگە توانای هێنانە بەرهەمی هەبێت ، بەڵام ئەوەش ئاسوودەیی‌و بارێکی ئەوتۆی دەوێت کە هەمیشە لە دەرچوونی گۆڤارو بوونی پارەو ئامادەیی چاپخانە دڵنیا بێت ، بەڵام ئەمانە هیچیان بۆ ئێمە نەبوون‌و نین‌و هــــەر تەکانیش دەدەینە خۆمان • بەڵێ ـ ژمارەکە ناودەنرێ ژمــارەی لــقی هەولێر لەبەرئەوە زوربەی بەرهەمەکان سیبەری ئەو لقەی پێوەیەو لــەو کەرەسانەیە کە ئەو لقە ناردوونی ، بەڵام هەوڵی ئەوەشمان دا کەمێــك تێکەڵی بکەین ، تا کۆششی لقی هەولێریش دیار بێت‌و بە چەشنێکیش ڕەنگ نەڕێژین کە نووسەران لە یەکتر جیابکەینەوە ، چونکە ئێمە یەکین‌و لە یەك یەکێتیداین •••

تا ژمارەکەی سەر بە سلیمانــی‌و چەنــد قسەی‌تــر هیــوامان وایە ژمارەی‌ترمان بێت •

**سەر« نووسەر »**

# ووشـــه

د. وریـا عمر امین
بـەشی کوردی ـ کولێجی پەروەردە
زانستگای بەغدا

ڕێزمانی تەقلیدی ووشەی بە بنج داناوە بـۆ شـی کردنەوەی زمان بەڵام نەیتوانیوە پێناسینێکی پڕ بە پێست بۆ چەمکی ووشـە داڕێژێ بشـێ تیۆرێکی گشتیی لەسەر دابنرێ ( ڕستە لە کۆمەڵە ووشەیێك پێك دێت ). ( بەشەکانی ئاخاوتن بریتین لە چەن گرووپێك ووشە ) بەڵام ووشە خۆی چی‌یەو چۆن لە زمانا دەس‌نیشان ئەکرێ بە تەواوی ساغ نەکراوەتەوە .

ئەو پێناسین و پەیرەوانەی بۆ چـەمکی ووشە دانراون ئەنجـامێکی ئەوتۆ بە دەستەوە نادەن و گەلێ ناوێزەیان تیـا دەرئەکـەوێ ، یا تەنیا بۆ چەن زمانێ ئەشێن ( ئەویش بە تـەواوی نا ) . هەندێ لـەم پێناسـین‌و پەیرەوانە ئەخەینە بەرچاو و لایەنە کزەکانی دەس‌نیشان ئەکەین .

١ ـ ووشە بریتی‌یە لە کۆمەڵە دەنگێکی بە زار دروسـت‌کراو مانایێك ئەبەخشێ .

بە پێی ئەم پێناسینە (گوڵ) ، (گەنم) ، (ڕەش) ، (بـا) هەر یـەکە ووشەیەکە چونکە هەر یەکەی لە کۆمەڵە دەنگێکی بە زار دروست‌کراو دروست ئەکرێ‌و مانایێك ئەبەخشێ .

(گوڵەگەنم) و (ڕەشەبا) هەر یەکە چەن ووشـەیە و چەن مـانا ئەبەخشێ ؟ (گوڵەکە)، ( گوڵەکان ) و (گوڵەکانم) هەر یەکە یەك ووشەیە ئایا لە ڕووی ماناوەش هەر یەکە یەك مانا ئەبەخشێ • چ پێوانەیێك وامان لێ ئەکات بڵێین ( گوڵ ) و ( بمانخواردنایە ) هەردووك بەر چەمکی ووشە ئەکەون لەکاتێکا (گوڵ) تاکە مانایێك ئەبەخشێ‌و ( بمانخواردنایە ) مانای ڕستەیێکی تەواوی لە ڕووی کاتەوە ئاڵۆز ئەبەخشێ • ؟

لە ( گوڵ و موڵ ) و (نەزان و مەزان ) دا (موڵ و مەزان) ووشەن یا نا؟ گەر ووشە بن چ مانایێکیان لە فەرهەنگا بۆ دائەنێیت• گەر ووشە نەبن چین ؟

(بار) کە زیاتر لە مانایێك ئەبەخشێ وەك لە (بارەدارێك) و ( بارێکی نالەبار) بە یەك یا دوو ووشە لە قەڵەم ئەدرێن ؟

گەلێ پرسیاری‌تری لەم بابەتە خۆیان ڕاست ئەکەنەوە بێ ئەوەی وەڵامێکی ڕێك‌و پێکیان بۆ بدوزرێتەوە • جگە لەمەش چەمکی (مانا) خۆی شتێکی شاراوەیە • مانای (مانا) خۆی سـاغ نەکراوەتەوە چۆن ئەشـێ شتێ بکرێ بە پێوانە بۆ پێناسینی شتێکی تر کە ئەو شتە خۆی شاراوە بێ‌و ساغ نەکرابێتەوە •

هەچ هەوڵدانێك بۆ پێناسینی ووشە لە ڕووی ماناوە ئەنجامێکی ئەوتۆ بە دەستەوە نادات •

٢ ـ ووشە هەر دانەیێکی سەر بەخۆیە لە زمانا بتوانێ (لە هەندێ بیئەدا) دەوری ڕستەیێکی تەواو بگێڕێت •(من) ووشەیێکە چونکە لە وەڵام دانەوەی (کێ خـواردی ) ئەڵێی (من) کـە دەوری ڕسـتەیێکی تەواوی گێڕا و کورتکراوەی ( من خـواردم ) ە • ئەمـە لەگەڵ پاشـگرو پێشـگری وەك ( هـەڵ ـ ، ـ ەوە ، دا ـ ، ـ ن ••

هتد ) ناکرێت بۆیە ئەمانە بە ووشە لە قەڵەم نادرێن •

لێرە دیسان چەند گیروگرفتێ هەیە • لەگەڵ پرپیبۆزیشن و ووشەی وەك ( لەگەڵ ـ تا ـ بۆ ـ بەڵام ••• هتد ) چی ئەکەین ؟

٣ ـ لە هەندێ زمانا بە پێوانەی فۆنۆلۆچی ووشە دەس نیشان ئەکرێت•
بۆ نموونە زمان هەیە لە ووشەکانیا هێز (نبرە) ئەکەوێتە سەر دوا
برگە • واتا شوێنی هێز ئەبێ بە سنووری ووشە وەك لە زمانی
کوردیدا ئەمەش بەداخەوە هەموو ووشەیێك ناگرێتەوە و گەلێ
ناوێزەیان تیا دەرئەکەوێ وەك ( بەڵام ـ چونکە ••• هتد ) •

زمانی تورکی و هەنگاری لەو جۆرە زمانانەن کە دارشتنی ووشەکانیان سەر بە سیستەمی ڤاوڵ هارمۆنین Vowel Harmony لەم جۆرە زمانانە ڤاوڵی رەگ لە ووشەدا چ جۆر بێ ڤاوڵی پێشگر و پاشگریش سەر بۆ هەمان جۆر دائەنوێنن • واتا گۆرینی شێوەی ڤاوڵ گوێزانەوەیە لە ووشەیەکا بۆ ووشەیێکی دیکە • لێرەش دیسان گەلێ ناوێزەیان تیا دەرئەکەوێ و ناشێ بکرێ بە پێوانە بۆ پێناسینی ووشە تەنانەت لەو زمانانەش کە سەر بەو سیستەمەن •

ئەوەی ووترا ئەمە ئەسەلمێنێ کە هیچ پێوانەیێکی سیمانتیکی یا فۆنۆلوجی نی یە بۆ پێناسینی ووشە لە زمانا بشێ بکرێ بە بنچ بۆ شی کردنەوەی زمان بۆیە زانایانی زمان رووویان لە ووشە وەرگێرا وەك کەرەسەیێکی بنچی بۆ شی کردنەوەی زمان و لە جێگیری ( بدیل ) تر گەران • یەکێ لەم جێگیرانە چەمکی مۆرفیم بوو •

مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە لە فۆنیمێ یا زیاتر پێك دێت و دەورێکی لە رێزمانا هەیە بە گۆرین و لابردنی هەر

فۆنیمێکی یا بەلەت لەت کردنی ، ماناو دەورە ئەسڵی یەکەی تیا ئەچێ واتا مۆرفیم چوار ڕووی هەیە :

١ ـ قاڵبێکی فیزیاوی هەیە ـ کە فۆنیمەکانیەتی •
٢ ـ مانایێکی هەیە •
٣ ـ دەورێکی لەرێزمانا هەیە
٤ ـ بە لەت لەت کردنو جیا کردنەوەی فۆنیمەکانی لەیێك ماناو دەورە بنجی یەکەی نامینێ •

بۆ نموونە ( پیاو ) مۆرفیمێکە چونکە •

١ ـ قاڵبێکی فیزیاوی هەیە ( پ ـ ی ـ ا ـ و ) ئەوەیە کە ئەبیسترێ وەك دەنگ لە قسەکردنا •

٢ ـ مانایێکی هەیە ( ئادەمیزادێکی نێرینەی بە تەمەن ١٨ ساڵ و بەرەو ژوور ••• هتد ) •

٣ ـ دەور ئەگێرێ لە رێزمانا بۆ نموونە ئەشێ دەوری بکەر ببینێ لەرستەدا وەك لە ( پیاو هات ) •

٤ ـ بەلەت‌لەت کردن و جیا کردنەوەی فۆنیمەکانی دەور و مانا بنجی یەکەی نامینێ ( پ ـ یاو ) (پیا ـ و) •• هتد هیچ ماناو دەوریان لە زمانی کوردیدا نی یە •

لەوانەیە هەندێ مۆرفیم لەتەکانی یا هەندێ لە لەتەکانی مانایان بۆ پەیا بێ ئەم مانایانە هیچ پەیوەندی یەکیان بە مانا ئەسڵی یەکەوە نابێ و مەسەلە ڕێکەوتە • وەك مۆرفیمی ( بازوو ) بە لەت‌لەت کردنی بەم جۆرانە ( با ـ زوو ) ، ( باز ـ وو ) •••( با ، زوو ، باز ) مانایان بۆ پەیا بوو بەلام هیچ پەیوەندی یان بە مانا ئەسڵی یەکەوە نی یە بەم جۆرە

(بازوو) یەك دانەی ساغە و یەك مۆرفیمە •

ووشـــەی ( کوڕەکەتـان ) کە بریتی‌یە لـــە ســێ مۆرفێمــی کــوڕ ـ ەکە ـ تان هــەر یەکــە لەمانــە قاڵبێــکی فیـزیـاوی‌ی هەیـە واتا هەر یەکە لە ڕیزە فۆنیمێك پێك دێت • لە زمانی کوردی‌یا هەر یەکە ماناو دەورێکیان پێ ئەسـپێررێ • بە جیـاکـردنەوەو قرتانـدنی هــەر فۆنێمیکیان مانا و دەورە بنجی‌یەکەی تیا ئەچی •

مۆرفیم لەچەن ڕوویێکەوە دابەش ئەکرێت •

١ ـ مۆرفیم ( سەربەست )ە یا ( بەند ) ە •

مۆرفیمی سەربەست ئەوەیە کە بە تەنیا وەك ووشەیێکی سەربەخۆ دەرئەکەوێ ، وەك ( کوڕ ـ خانوو ـ چیا ••• ) مۆرفیمی بەند ئەوەیە کە هەرگیــز وەك دانەیێــکی ســەربەخۆ دەرناکــەوێ و ئەبێ لەگەڵ مۆرفیمێکی‌تر دەرکەوێ وەك ( ەکە ، ـ ان ، هەڵ ـ ، نە •• هتد )

٢ ـ مۆرفیم ( ڕەگ ) ە یا ( ئەفێکس ) ە ڕەگ ئەو بەشەی ووشەیە کە ئەمێنێتەوە دوای لابردنی هەموو ئەفێکسەکان •

جیا کردنەوەی ئەم دوو جۆرە مۆرفیمە لەیێك کارێکی زەحمــەتو ئاڵۆزە بەشێوەیێکی گشتی ئەشــێ بووتــرێ کە ڕەگ (ناووکی) ووشە پێك ئەهێنێ ( ئەفیکس )یش ئەکەوێتە ریزی دووەمەوەو سەر بە ڕەگن • ڕەگ لە ئەفێکس درێژترە و بە ژمارە زۆرترە لە هەر زمانێکا • ژمارەی ئەفێکس سنووردارە (داخراوە) واتا ڕێگا نادات بۆ هی‌تر بچێتە ناویانەوە• گۆڕینی ژمارەیان بەندە بە گۆڕینی سیستەمی (ڕێزمانی) ی زمانەکە بــۆ نموونە ڕاناوەکانی تملك لە زمانی کوردیدا ( م ـت ـی ـمان ـ تان ـ یان ) ئەم شەشەیە و داخراوە ڕێگا نادەن بــە هی‌تر بێتە ناویانەوە هــەر

ئەمانەن لای هەموو قسەکەرێکی ئەم ( شێوەیە ) • کەچی مۆرفیمی ڕەگ سنووری بۆ نی‌یە و کراوەیە و ژمارەی هەمیشە لە گۆڕینایە بە نەمانو پەیابوونی هی تازە چ بە وەرگرتن چ بە دارشتن •

ئەفێکس سێ جـۆرە ( پێشـگر ـ ناوگـر ـ پاشگر ) پێشـگر ئەو ئەفێکسەیە کە لە پێش ڕەگەوە دەرئەکەوێ وەك ( هەڵ ـ ، ڕا ـ ، نە •• هتد ) لە ( هەڵگرتن ـ ڕاگرتن ) دا • ناوگر ئـەو ئەفێکسەیە کە لە ناو ڕەگدا دەرئەکەوێ لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرە ئەفێکسـە نی‌یە بۆ نموونە لە زمانی عەرەبی‌یا ڕەگی Ktb چەمکی نووسین ئەگەیەنێ • ناوگری i - a ئەیکـا بـە Kitab ( کتێب ) و ناوگری a - i ئەیکا بە Katib ـ نووسەر ) •

پاشگریش ئەو ئەفێکسەیە کە لە دوای ڕەگـدا دەرئەکـەوێ وەك ( ەوە ، ان ) لە ( هاتنەوە و کوڕان ) دا •

٣ ـ مۆرفیم مۆرفۆلۆجی ( اشتقاقی ) یە یا ( ڕێزمانی ) •

مۆرفیمی مۆرفۆلوجی ئەوەیە کـە ئەچێتە سـەر مۆرفیمی تر بـۆ دروست کردنی ووشەی تازەی خاوەن مانای تازە وەك ( هەڵ ـ ڕا ـ دا تێ •• هتد ) لە ( هەڵگرتن ، ڕاگرتن ، داگرتن و تێ گرتن ) دا •

مۆرفیمی ڕێزمانیش ئەوەیە کـە ئەچێتە سەر ووشـە بۆ دەربڕینی پەیوەندی‌ی نێوان ئەم ووشەیە و ووشـەکانی تر لـەناو چوارچێـوەی ڕستەدا ڕاناوە لکاوەکانی لەگەڵ فرمانا دەرئەکەون لە زمانی کوردیـدا هەموو مۆرفیـمی ڕێزمانین چـونکە پەیوەندی‌ی نێـوان بکەر و فرمـان لەڕستەدا دەرئەبڕن •

من نووسـت ـ م

ئێمە نووسـت ـ ین

لەم ڕستەیەدا •

کچە جوانە زیرەکەکە هات •

(ە)ی ( کچە ) و (جوانە) مۆرفیمێکی ڕێزمانییە چونکە دەوری بەستنی ( ناو ) و (سیفە)ی بەیەکەوە گێڕا لە ناو چوار چێوەی ئەم ڕستەیەدا •

مۆرفیم و جۆرەکانی لەم وێنەیەدا ڕوون کراوەتەوە •

ئەو تیرە خاڵخاڵانە ئەوە ئەگەیەنێ کە زۆربەی ئەفێکسەکان لە جۆری مۆرفیمی (بەند)ن و ڕەگەکان لە جۆری مۆرفیمی (سەربەست)ن • مۆرفیمی ڕێزمانیش هەموو ئەفێکسن•

بەم جۆرە لەم قۆناغەدا ئەتوانین بڵێین(ووشە) ئەو دانە (ڕێزمانی)یەیە یا لە مۆرفیمێ یا یاچەند مۆرفیمێ پێك دێت • ئەم مۆرفیمانە بەشێکیان مۆرفۆلۆجین و بەشێکیان ڕێزمانین • مۆرفیمە ( ڕێزمانی ) یەکان سروشتی پەیوەندی نێوان ووشەکان لە ناو چوار چێوەی ڕستەدا دەرئەبڕن بۆیە ووشە لە دەرەوەی ڕستە پێ ناناسرێت •

**ـ ماویەتی ـ**

# گەشتێك بە ڕۆمانیادا

ئازاد دڵزار

★ ★ ★

## ١ ـ جوانترین یـاد

بۆ ئەو ئێشکەرە ڕۆمانیایی‌یەی لە چێشتخانـەی
( پۆلیڤار ) و لە سێنتەری بوخارستدا بە ڕووێکی
خۆش‌و بە کوردیێـکی ڕەوان بـە خێرهـاتنی
کردین •

لەو دیوی جامخانەکەوە
وورد دەمڕوانی
سەرنجم دەدا لە قوپکەی کڵێساکان
لە پەیکەرو ، لە هینجانەی پڕ لە گوڵو
لە کۆتری بەر دەست‌و پێی منالەکان
جار نا جاریش
لە گەڵ هاوڕێی بەرامبەرم
ورد ورد یەکتریمان دەدوان
لەو کاتەدا
لاوێکی ڕۆح سووکی ڕۆمان

هاتە نزیك
گوتی : « کوردن ؟ بەخێر هاتن
بەخێر بێن سەر هەردوو چاوان • »
بڕوا بکەن لەو کاتەدا
برووسکەیەك دای لە ناخم
ئیسقانەکانم داگیرسان
منەتبار بووم
هێند حەپەساو منەتبار بووم
نەختێك بە ڕووی خەنیمەوە
لە ناوەوەش کەوتمە سووتانو داچۆڕان ! !

بوخارست : ئابی ١٩٨٠

**٢ ـ شمشاڵ**

شمشاڵ لە « ڕیستورانێکا »
خەڵکی خستبۆ سەماو سووڕان
هەر ئەو شمشال
کاتێ شوانێکی کوردستان
لە شاخانا فووی پیا کرد
هاتە ناڵەو
چیاییەکان لە دەورەیا
گەلێ گریان !

بوخارست : ئابی ١٩٨٠

### ٣ ـ شۆڕە بی

شەپۆلەکان بەتاو یەکتریان ڕاودەنا
شنەی با درەختەکانی خستبۆ زۆران
دەریا بێ باڵ سەمای دەکرد ،
کراسێ شینکاری هەڵدەکشا
تا سەر چۆکان !
منیش بۆ جوانێ دەگەڕام
تیا بەدی کەم
جوانی چیاو خەمی خەستی چیایەکان •
لە دوورەوە
شۆڕە بی‌یەك ناسیمیەوە
بە غەمباری نوشتایەوەو
دەستەکانی خستمە سەرشان •

**کونیسانندا ـ ماماما**
**ئابی ١٩٨٠**

# چەند ووشەیەك دەبێ بووترێ

فوئاد مەجید میسری

ئەم ووتارە پێشەکیی لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی چیرۆکێکی کاك محەمەد فەریق حەسەن کە بۆ ژمارەی داهاتوو دانراوە •

ووتارەکە بە پێشەکیو خۆیو چیرۆکەکەشەوە لاپەڕەی زۆری دەویست ، هەستی ڕۆژنامەگەری وایکرد پێشەکیەکە بکەین بە بەرکوڵو لەم ژمارەیەدا بلاوی بکەینەوە ، ئەویترو چیرۆکەکەش بۆ ژمارەی داهاتوو •• کنگرو ماست بۆ وادەی خۆی •••

هیواداریین ئەم بیرانەی نووسەر هەندێك موناقەشەی مەوزووعییان لێ پەیدا ببێت •

« نووسەری کورد »

لای نووسەرانو ئەدەبدۆستانو سەرپاکی ڕۆشنبیران شاراوە نییە کە لەدوای سالانی حەفتاوە ، ڕەخنەی ئەدەبی گوڕو گوژمێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە دی ، توانی تاڕادەیەکی باش ڕۆلی خۆی لە بواری تیۆریی

ئەدەبو ڕەخنەی ئەدەبیدا ببینێ • کەسیش نی یە ئەو حەقیقەتە نەزانێ
کە ئەدەبیاتی کوردی تا ئەوکاتەی کتێبەکەی دکتۆر عیزەددین مستەفا
ڕەسووڵ کەوتە بەردەست خوێنەران بابەتی ڕەخنەی زانستی یانەی تێرو
تەسەلی بەخۆیەوە نەدیبوو • ئەو تاك تاك نووسینانەی پێشتر بە ناوی
ڕەخنەوە لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی یەکاندا بڵاودەکرانەوەو بەرهەمە
شیعری یەکانیان هەڵدەسەنگاند ، لە سنووری قسەی سەرپێ یی و ئەو
مەفاهیمە کۆنانە تیپەڕیان نەدەکرد کە پشتیان بە ئەحکامی بەلاغەی عەرەبی
دەبەست • چیرۆکی کوردی کە تەمەنی لە نیو سەدە هەڵکشاوترە ، لە
شیعریش کەمتر ڕەخنەی بەنسیب بووە • ئەو بارە ئەدەبی یە کە هۆیەکەی
دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی زەمینەیەکی ڕۆشنبیری پتەو ، کارێکی کرد
ئەدەبیاتی کوردی لە قۆناغێکی دیاری کراودا لە لقێکی گرنگی بابەتە
ئەدەبی یەکان ـ کە ڕەخنەیە ـ بێبەش ببێ • سەرەنجامیش بووە هۆی
ئەوەی بە سەرێك جەماوەر نەتوانن لە ناوەرۆکی بەرهەمو ئاستی
هوشیاریی نووسەرو پلەی داهێنانو ڕێبازە ئەدەبی یەکەی تێ بگەنو
شتێکی ئەوتۆیش لەبارەی ڕەخنەوە نەزانن • بە سەرێکی تریش ـ
نەبوونی ڕەخنە ـ وای لە زۆربەی نووسەران کرد خۆیان بە دەستەیەك
خەڵکی هەڵبژاردەی خاوەن ئیمتیاز بزانن ، بەڕادەیەك حاڵ گەیشتە
ئەوەی بەرهەمەکانیان لەئاستێکدا دابنێن مایەی قسە لەسەر کردنو
ڕەخنە لێ گرتنو مشتومڕ نەبێ •

ئەم جۆرە لێکدانەوەیە ، ئەگەرچی خۆی لەخۆیدا دەلالەت لە
خۆبەزل زانین دەکا ؛ ڕەگو ڕیشەیەکی لەوە قووڵتریشی هەیەو
دەچێتەوە سەر بنەمای فیکری ئەو نووسەرانە کە لە بنەڕەتدا باوەڕیان
بە ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتن نی یەو بە ڕێگایەکی ڕەوای گەشەکردنی
هوشیاریی ئادەمیزادو هۆی پاکبوونەوەی مرۆڤ لە خەوشو هەڵەی

فیکریی‌و پراکتیکی کۆمەڵایەتی دانانێین • جا ئەگەر جاروباریش بە نووسین قسە لە ڕەخنەو پێویستیی بوونی کرابێ ، هەر بۆئەوە بووە ، ڕەخنەگری پسپۆڕو ئەکادیمیی بێتە کایەوە !• ئەم داخوازیو ئاواتە هەرچەندە بەڕواڵەت دیاردەیەکی دڵخۆشکەرە بووە ، لە جەوهەردا هەر ئەو بەیتو باڵۆرەیەیە کە ڕەخنەگرو تیوریستەکانی جیهانی سەرمایەداری بەگوێی خەڵکییاندا داوە چونکە لای ئەوانە ڕەخنە کاری دەستەیەك خەڵکی پسپۆڕە• بەوپێیە ئەدەبو هونەر بەگشتی دەخەنە خانەی بەرهەمی مادی‌یەوەو لەسەر ڕێوشوێنی یاسای دابەش‌کردنی کار « تقسیم العمل » هەڵس‌و کەوتی لەگەڵدا دەکەن •

بنچینەی فەلسەفی ئەم لێکدانەوەیەیش لەوەوە سەری هەڵداوە کە ئەدەب بە شێوەی جۆربەجۆر لە ئەرکە کۆمەڵایەتی‌یەکەی ڕووت ئەکاتەوەو دەستەیەك خەڵك لە جێگای جەماوەر دادەنێ‌و مافی بیروڕا دەربڕین‌و مشت‌ومڕو قسە لەسەر کردنی هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بە جەماوەر ڕەوا نابینێ !!•

لەوکاتەیشەوە کە ڕەخنەی زانستی‌یانە وەك ئەنجامێکی حەتمیی گەشەکردنی باری ڕۆشنبیریی هاتە کایەوە ، دەیان کۆسپ‌و تەگەرەی خرایە بەردەم‌و بەم یان بەو شێوە ڕێگای لێ گیرا • سەرەتا بەوناوەوە گوایە ڕەخنە پەیوەندی بە فەلسەفەو سۆسیۆلۆژیاو سایکۆلۆژیاوە نی‌یەو ناکرێ داهێنان بکرێتە قوربانیی ناوەڕۆکی بەرهەم !• بەکورتی لەژێر پەردەی بەرگری‌کردن لە داهێناندا، شێوە پەرستی کرایە کاڵایەك‌و بە باڵای ئەدەبیاتی کوردیدا بڕاو ئەو ئەدەبەیش کرایە ئەدەبی باو• ئەوجا کە زانرا هەروا بەئاسانی قەڵەمی ڕەخنەگران لە کار ناکەوێ‌و پەیامی پیرۆزی خۆیان بە جەماوەر دەگەیەنن ، برادەرایەتی‌و پەیوەندی شەخسی لەگەڵ ئەو نووسەرانەی سەرپەرشتیی گۆڤارو ڕۆژنامەکان دەکەن ، کرایە

ئوسلوبێك بۆ راگرتنی نووسینە رەخنەیی‌یەکان ، بەوناوەوە گوایە هەل‌و مەرجی رەخنەیان تێدا نی‌یەو شیاوی بلاوکردنەوە نین‌و پێویستە ئەو تەوژمە بەربەست بکرێ !!!• شان‌بەشانی ئەمەیش لەسەر یەکتر نووسین‌و دەستیاوو پیاهەلدانی یەکتری‌و بۆ مەبەستی تایبەتی لە زۆر شوێندا جێگای باس‌و ڕەخنەی ئەدەبی‌یان گرتەوە!!• سەرەڕای ئەمانەیش بۆ سووك‌کردنی هەندێ رەخنەگر گەلێك ناوو ناتورەیان لێ نراو زۆریشی لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو رۆژنامە کوردی یەکان ـ بە ناوی رەخنەی ئەدەبی‌یەوە ـ بلاوکرایەوە •

سەرەڕای ئەمانەیش جلەو بۆ قەلەم شل‌کراو بێ‌هەست بە لێ‌پرسینەوە کردن‌و لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەیەکی رەسمی هەموو ئەو نووسەرانەی لە بواری رەخنەی ئەدەبیدا تەقەللایەکیان هەیە ، کران بە « سەگ‌وەڕ » !!•• پاشان نازناوی ژدانۆڤی لەو کەسانە نرا کە پەیڕەوی یاسای بنکەکانی ئیستاتیکای زانستی دەکەن !•• بەلام ژدانۆف کێیە ؟ ، ژدانۆڤی‌یەت چی‌یە ؟! ئەمەیان پێویست ناکاو گرنگ نی‌یەو فەرهەنگی ئەوانە نایگرێتە خۆی •• گرنگ ناوو ناتۆرە لێنان‌و جوونەوەی بیروڕای رەخنەگرو تیۆریستەکانی جیهانی سەرمایەداری‌یە ، کە بە مەبەستی ئیفلیج کردنی هۆشی جەماوەر ، دژ بەو ئەدەبیاتە دەوەستێ کە تەعبیر لە ڕەوتی گەشەکردنی کۆمەل دەکا • لەم دوایی‌یەشدا زاراوەیەکی نوێ هاتە گۆڕێ‌و ناوی « تەجمیع » لە نووسینە ڕەخنەیی‌یەکان نراوگوایە ئەوانە بریتین لە کۆکردنەوەی بیرو بۆچوونی چەند نووسەرێکی جیهانی‌و مافی بەسەر ئەدەبیاتی کوردی‌و داهێنانی نووسەرانی کوردەوە نی‌یە !!•• کەچی کۆکردنەوەی بیروڕای « ئەلیوت »و « ئەزرا پاوەند »و « کامۆ »و « سارتەر »و « بۆدلێر »و « ئەدۆنیس »و « تەڕادولکوبەیسی »و ••• تاد •• دەبێتە نموونەی ڕەخنەی باوو سەیر

ئەوەیشە بە زۆرەملی بەسەر خوێنەری کورددا دەسەپێنرێ‌و بە داهێنانیش لە قەڵەم دەدرێ •

هەندێکی‌تریش ، هەر کە دەرفەتێکیان بۆ دەرەخسێ قسە لە ڕەخنەی خۆماڵی دەکەن !! ئەم مەسەلەیەیش بەقەدەر ئەوەی کە لێکدانەوەیەکی بێ‌سەروبەرە ، ئەوەندەو زیاتریش دەلالەت لە تێ‌نەگەیشتن‌و نەشارەزاییی ئەو نووسەرانە دەکا کە بانگی بۆ هەڵدەدەن• ڕاستەو نکولی لەوە ناکرێ کەئەدەب سیماو شەقڵی نەتەوەیی هەیە ، وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پەیوەندی نووسەر تێیدا بەواقیعەوە بەرجەستە دەبێ • جا ئەو نووسەرە ، سەر بە چ ئایدۆلۆژیایەکەو چۆن دەڕوانێتە ژیان ، ئەمەیان مەسەلەی بنچینەیی داهێنانەو ئەرکی سەرەکیی ڕەخنەگر لەم خاڵەوە دەست‌پێ‌دەکا • نووسەر ـ هەر نووسەرێك ـ بیەوێ‌و نەیەوێ ئایدۆلۆژیای چینێك یان توێژێکی کۆمەڵایەتی دەردەبڕێ ، سا ئەو چینە لە خزمەتی پەرەسەندنی کۆمەڵدا بێ ، یاخود دژ بە ڕەوتی بەرەوپێشەوە چوونی کۆمەڵ بێ •• هەموو ڕێبازو قوتابخانە ئەدەبی‌بەکانیش لە ئەنجامی حەتمیی پرۆسیسی گەشەکردنی کۆمەڵدا هاتوونەتە کایەوەو ئاوێنەی باری ژیانی کۆمەڵ بوون •• تا پەیوەندی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لە کۆمەڵگای ئەورپاییدا نەش‌ونمای نەکرد ، ڕۆمانتسیزم نەهاتە گۆڕێ • هەر ئەنجامی گەندەڵ‌بوونی ئەو سیستەمەیش بوو ، هونەرو ئەدەبی ڕیالیزمی ڕەخنەیی هێنایە کایەوە • پەرەسەندنی چەندیەتی‌و چۆنیەتی چینی کرێکارو گەشەکردنی بیری سۆشیالیستی‌و بنج‌بەست بوونی ئەو سیستەمەیش ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌یان وەك حەقیقەتێکی مێژوویی چەسپاندو دەیان کەڵە نووسەری وەك « جاك لەندەن »و « مەکسیم گۆرکی »و « شۆلۆخۆف »و « ئەتماتۆف »و « نازم حیکمەت »و

« گۆران »و ••• تاد وزەی داهێنانیان لە بۆتەی مەسەلەی ڕەواو عادیلانەی مرۆڤایەتیدا تواندەوە •

ڕەخنەی ئەدەبی ، هەروەك لقێکی گرنگ‌و بایەخداری ئەدەبە ، خۆی لەخۆیدا زانستێکە • ئەو نووسەرەی گەرەکی‌یەتی توخنی ئەم لایەنە بکەوێ بەر لە هەموو شتێك دەبێ شارەزای خاسی‌یەتی هەموو قوتابخانەو ڕێبازە ئەدەبی‌یەکان بێ • سەرەڕای ئەمانەیش لەسەریەتی ئاگاداری‌یەکی باشی لە زانستە مرۆڤایەتی‌یەکاندا هەبێ • ئەمە جگە لەوەی دەبێ ئەو حەقیقەتەیش بزانێ کە هەر فەلسەفەیەك ئیستاتیکای خۆی هەیەو لەو ڕوانگەیەوە کاری داهێنان هەڵدەسەنگێنێ • ئەو نووسەرەی ئەدەب بە مەسەلەیەکی « ذاتی »ی رووت لەقەڵەم دەدا ، پێ‌بزانێ یان نەزانێ ، بیەوێ‌و نەیەوێ، ئەدەب لە سەرجەم مەسەلە کۆمەڵایەتی‌یەکان دادەبڕێ‌و دەکەوێتە داوی ئایدیالیزمی‌یەوە • چونکە ئەدەب وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی‌و مێژوو کرد ، هەمیشەو لە هەموو بارو زرووفێکدا بەچەشنی تێغێکی دوودەمە • گەر بێ‌و بە بارە ڕاست دروستەکەیدا بەکارنەهێنرێ ، بەرەی دژ بە جەماوەر ، ڕاستەوخۆ ، یان ناڕاستەوخۆ بۆ سوودو قازانجی خۆی دەیخاتەکار •

لایەنی بنچینەیی لە پرۆسیسی داهێناندا ئەوەیە ئاخۆ نووسەر چۆن دەڕوانێتە ژیان ؟• یان بەجۆرێکی‌تر بڵێین : پەیوەندی نووسەر بە واقیعەوە چۆنە ؟•• جا کە ئەرکی ئەدەب نیشان‌دانی واقیع بێ ، دەبێ ئەو پرسیارەیش بکەین ئاخۆ چ‌بابەتێك ڕەنگ دەداتەوەو چۆنیش ڕەنگ‌دەداتەوە ؟•

ئەو نووسەرانەی بە ڕەخنەی زانستی تەنگەتاو دەبن‌و لە بەردەم یاساکانی ئیستاتیکای زانستیدا بڕستیان لێ دەبڕێ‌و سەرەگێژەیان تووش

دێ ، لەوە تێنەگەیشتوون کە تەنانەت نووسەرە وجوودیو عەبەسیەکانیش هەڵگری بیروڕای سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیی خۆیانن‌و لە ڕوانگەی فەلسەفی خۆیانەوە دونیای دەوروبەر دەبینن • « کامۆ » کە بە پێشەنگی فەلسەفەی بێهوودەیی دادەنرێ ، راستو ڕەوان دان بەوەدا دەنێ کە مەبەستی سەرەکیی لە نووسینەکانی ، خولقاندنی پاڵەوانی عەبەسیە •دیارە ئەوانەیش هەر وێنەی ژیان دەگرن بەڵام چۆن‌و لە چ ڕوانگەیەکەوە ؟! جیاوازیی بنچینەیی نێوان ئەوانو نووسەرە سۆشیالیستەکان ئەوەیە : ئەوان ژیان لە مەودایەکی چەقیوو سەقامگیردا دەنەخشێنن ، چونکە باوەڕیان وایە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی نییە بتوانێ چارەسەر بۆ گیروگرفتو ناتەواوییەکانی ژیانی ئادەمیزاد بدۆزێتەوە ! ! •• بۆیە پەنا دەبەنە بەر سەربەستیی تاکە کەس‌و خودی ئادەمیزادو خواستە تایبەتییەکانی دەکەنە بناغەی لێکدانەوەو هۆی هەڵس‌وکەوتی مرۆڤ • نووسەری سەر بە ریالیزمی سۆشیالیستی ، ناکۆکییە کۆمەڵایەتییەکان دەکاتە ڕوانگەی بیرو لێکدانەوەیو ئەم یاسایە ـ واتە یاسای ناکۆکی بە داینەمۆی هەموو گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیو سروشتیو فیکریی دەزانێ • نووسەری سەر بەم قوتابخانەیە ، بەهۆی دەرخستنی ڕۆڵی تاکی نموونەییەوە ، بیروڕای سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیو ئیستاتیکی چینێکی دیاریکراو ئاشکرا دەکا • لەبەرئەوە بەتەنها وێنەی واقیع ناکێشێ ، بەڵکو پەیوەندییەکانی دەردەخاو تەقەللای گۆڕینیشیان دەدا •

من بەش بەحاڵی خۆم بەمجۆرە لە داهێنانی هونەریی گەیشتوومو هەر ئەم بۆچوونەیش بە راسترین لێکدانەوە دەزانم‌و هەر بابەتێکیش شەرەفی نووسینیم پێبڕابێ لەبەر ڕۆشنایی ئەم تیۆرییە توخنی کەوتوومو بیروڕام

لەسەر دەربڕیوە جا مایەی ڕەزامەندی خاوەن بەرهەم بووبێ یـان نـە ، ئەوەندەم بەلاوە مەبەست نەبووەو نایشبێ • گرنگ ئەوەیە قەڵەمێك بـۆ مەبەستی تایبەتی نەکەوتبێتە گەڕ ، گوێ بە سەرزەنشـتو نـاڕەزاییو ناووناتۆرە نادا ••

---

لقی یەکێتیی نووسەرانی کورد لە هـەولێر ئـەرکی
لەچاپدانی ئەم ژمارەیەی لە ئەستۆ گرتووە •

---

# هەڵبەستێکی مەزن

مارف عمر گول

تۆ چاکت کرد
نەتهێشت دەستم بە کەمەری خەمێکدا کەم
کەندەڵانی پایزێکی دڕکاویم بێ شاد بکا
نەتهێشت ئەژنۆم بەسەر رۆخی چەمێکدا دەم
هەرەس بێنی ،
دوور مەکەوە
دڵم لەژێر هەردوو پێتا تەخت دەبێ
هەر بە تەنیا بەناو بەردو دڕکە زیدا هەنگاو مەنێ
لە گەڵتا دێم •• لە گەڵما بێ
گەڵای سەوزی هیواکانت لە دڵمدا
وەکو نێرگز تەڕو گەشن
گەڵای سەوزی هیواکانم وەک سەرپۆشێ
بدە بەسەر پرچەکەتا
با وەیشوومەی ئەم سەدەیە نەیژاکێنێ

تۆ پرچەکەت هەڵناوەرێ
بەسەر پرچی هەڵوەریوما دایبهێنە

★ ★ ★

خۆت دەزانی پەنجەم بۆتە پەڕەموچو
لەسەر هەموو دەفتەرێکا
تابلۆی سووری نیشتمانم دەنەخشێنێ
ئەو شیعرەی وا ڕۆژگارێکە دەمکرۆژێ
لە باڵای خۆم گەورەترەو
دێڕ دێڕ وشەو گوڵئەستێرە بەسەر دڵما دەبارێنێ
ئەی ـ هەڵبەست ـ و دێڕە شیعرم
هەموو ڕۆژێ کە شێت دەبم
ئەو شیعرەی بۆ چاوی گەشی تۆم نوسیوە
هەر کە نمنم وەك بارانو وەك پڕووشەی بەفری ڕۆژگار
ورد ورد بەسەر پێڵوما هات
بە تەکانێ ڕێگا دەبڕێو ، دەگاتە لات •

**کەرکووك ١٩٧٩**

١

# ڕشانەوەی ناو گۆڕەپانەکە

حەمەکەریم هەورامی

ساڵی رەمەکە بوو ، قاتو قڕی ساڵەکە لەبەر بێ بارانیو دەرامەت نەبوو ، ئافەتێك بوو دەرفەتی کەسی نەدەدا ، دەنگو باسێکی وەها پەیدا بووبوو کە گوایا لە شارەکاندا نەخۆشی رشانەوە پەیدا بووە ، ئەوەی تووشی ببێ تەڕایی لە لەشی دەبڕێو دەمارەکانی رەش دەکاتەوەو دەمرێ ••

خەڵکی ئاریانەی ئەمدیو لە ترسی ئەم نەخۆشی‌یە ئارامیان لێ بڕابوو •• خۆ خەڵکی ئەم دێیەش ، مێشیان دەکرد بە گامێش ، شتێکیان بە زارەوە بگرتایە هەر دەیانووتو دەیانووتەوە •• هەموو ئێوارەیەك لە دیوەخانی کوێخا رەسوڵ کۆدەبوونەوەو باسی رشانەوەکەیان دەهێنایە پێشەوە ، باسی « حەمە بۆر » هەر مەکەن لەمە دادەنیشت یەکسەر باسەکەی دەکردەوەو قسە بە هەرلایەکدا دەشکایەوە ، ئەو دەی‌هێنایەوە سەر رشانەوەکە ، ئەوەندەی‌تر سامناکتری دەکرد •• زۆربەی هەرزەکارەکانی ئاریانەی تێ گەیاندبوو کە یا خۆیان بشارنەوە، یان بڕۆن بۆ شار خۆیان بکوتن ••

ئەوشەوە خەڵکی ئاریانە لە دیوەخانی کوێخا رەسوڵ کۆبوونەوەو تەگبیریان هاتە سەر ئەوە یەکێك بـۆ شار بنێرن ، بۆئـەوەی بـزانن چارەسەرێك بۆ ئەو ئافەتە نەدۆزراوەتەوەو تا چرادەیەك نەخۆشی یەکە بڵاوبووەتەوەو کەی دەگاتە گوندەکەیان •••

کێ لەورۆژە پڕ لە مەترسی یەدا بەرەو شار دەڕوا ؟•• زۆربەی هەرزەکارە خەنجەر بە بەرۆك‌و چەتفەلارەکان لە ترسی تووش‌بوونی رشانەوە خۆیان شاردبووەو هەندێکیشیان بـۆ کوتاندن بـەرەو شــار چووبوون‌و نەگەڕابوونەوە ••

کوێخا رەسوڵ ، رووی کردە هەمووان کـێ کوڕەکەی خـۆی دەنێرێ ؟•• هەموو بێ دەنگ بوون‌و متقیان نەکرد •• لەخوارەوە مام حەمـکۆ گۆمی بێدەنـگی شڵەقاند : « مـن ••• کـوڕەکەی من •• چەتۆ •• » •

کوێخا : (رووی کردە حەمکۆ) چەتۆ ؟!•• ئەی ئاژەڵەکانمان؟!••

حەمکۆ : خۆم ئاگام لێیان دەبێ ••

کوێخا رەسوڵ : نە چەتۆ پیاوی ئەم ئیشمەیەو نە تۆش هێزی ئەوەت ماوە ••

حەمکۆ : چەتۆ کوڕی خۆمەو تیـا ڕادەبینم •• پیـاو لـە ڕۆژی تەنگانەدا دەبێ هەموو هێزیکی خۆی خڕبکاتەوە ••

وا بڕیاردرا : چەتۆ بەرەو شار بڕواو مام حەمکۆیش لەجیاتی چەتۆی کوڕی ئاژەڵەکان بباتە ناو پاوانەکان •• « حاجی مەلا شێخ سـەید » یش دەبێ دەم‌و نفوسی خۆی بخانەکارو پەیتا پەیتا بڕوانێتـە رووی کتێب‌و نووشتەی لادانی دەردو بەڵا بۆ هەموو ماڵەکان بنووسێ ••

بەیانی زوو لەگەڵ گەردوگوڵی بەیاندا چەتۆ بەرەو شار کەوتەڕێ
مام حەمکۆیش ئاژەڵەکانی دێی بەرەو دۆڵەکەی پشت گوند
ڕاپێچ کرد ..

« عەبە خەنە » پیاوێکی رووتەڵەی شێتو شێواو بوو .. ئەویش
کەوتە تەك مام حەمکۆو بە لیسەکەی دەستی گاگەلەکەی لێ دەخوڕیو
بەتووندی بەسەر ئەو کەرو گایانەدا کە لارێیان دەگرت دەیەڕاندو کە
دەگەیشتە ئاست کەرگەلو ئێسترەکان لیسەکەی ئاراستەی لاسمتیان
دەکرد ..

ئەو رۆژە خەڵکەکە زۆر پەرۆش بوون ، هەر چاوەڕوانی
هاتنەوەی چەتۆ بوون ..

« ئەحل » : پیاوێکی نەگریسو چاولەدوو بوو .. دڵنیا بوو کە
چەتۆ لە حەوت کوڕەکەی پیاوانەترە .. کەچی دەیویست دڵی خەڵکەکە
کرمۆڵ بکات ، بۆیە ؛ دەمزادەم دەیووت .. بەتەمای چەتۆن هەواڵی
شارتان بۆ بێنێتەوە ؟! .. یان بەتەوسەوە ، دەیووت .. چاوەڕوانی
کێن ؟.. چەتۆ !؟ .. بەڵام خەڵکەکە هەر چاوەروان بوونو چاویان لە
رێگەی ئەوبەر کلا نە دەکرد ..

کوێخا رەسوڵ ، پتر پەرۆشی ئەوە بوو کە ئەگەر ، بار بکەن بۆ
ئاریانەی ئەودیو ، دەستە پاچە دەبێت ، جگە لە « نازدار » ی کچیو
پیرەژنەکەی کەسێکی تری نی یە .. بەڵێ لەم ئاریانەدا خەڵکەکە هەموو
بەردەستی ئەون بەڵام لە کاتی رەمدا کەس بە کەس نی یەو گێژەنەی
بەندو باو دەپسێت .. ئەو ، ئەوەی هەیە هەوڵی داوەتا خۆی
گەیاندووەتە ئەم ئاستە ؛ ئەمە لەلایەك . لە لایەکی ترەوە کە ئەگەر
چووە ئەودیو لەوێ ئەم کوێخایەتی یەی بۆ نالوێ .« ناو هیچ نی یە ،

لەراستی‌دا لە گوندی خۆمدا هەم ئاغام و هەم کوێخا•••» کاسەی سەری خۆی بەو جۆرە خەیالانە ئاوساندبوو •• ڕۆژ لەسەر لێواری زوورگەکانی ئەوبەر ئاریانەوە ساجێکی سوورەوکراو بوو ، سێبەری ترۆپەکەکانی ڕماندە ناودێ ••

خەڵکەکە هەر لە چاوەڕوانی نەکەوتن ، «حاجی مەلا شێخ سەید» بەپەلە لە ماڵ دەرپەڕی ، مەسینەیەکی پڕ لە ئاوی بەدەستەوە بوو ، بەگورجی بەرەو گڵکەندەکەی پشت مزگەوت تەکانی‌دەدا ••••
ئافرەتی گوندەکەش بە ڕەنگی پەڕیوو ناوچاوانی هەڵڕوسکاوەوە ، چاوەڕوانی هاتنەوەی ئاژەڵەکانیان بوون ، لەنێوانیاندا باس باسی ، چەتۆ بوو •• لەلایێکەوە چووە بۆ شارو نەهاتووەتەوە لە لایێکی‌ترەوە گاگەڵ دیار نی‌یەو لەوانەشە گاو گۆلك تێلاو بووبن‌و ئیتر ئەم ئێوارە بە بێ‌شیر سەردەنێنەوە ••

« نازدار »ی کچی کوێخا ڕەسووڵیش بە بۆنەی چاوەڕوانی گاگەلەوە چاوێکی بەم‌سەرو بەوسەری گوندەکەدا گیرا هەرزەکارێکی بەرچاو نەکەوت •• بەخوا ئێوارەیەکی ڕەشە •• کەندی پشت مزگەوت مەلای بە خۆی‌و مەسینەیەوە قووت‌دا •• مام حەمکۆو عەبە خەنە بە خۆیان‌و گاڕانیانەوە چەمی دوڵە ڕەش هەڵی‌لووشین •• چەتۆ ڕۆیشتنی هەبوو گەڕانەوەی نەبوو ، هەندێ لە پیاوە پیرەکان چاوەڕوانی بانگ‌دانی مەلایان دەکرد ؟ دەنگ نەبوو ، ئافرەتەکانیش لەسەر گویسەبانەی ماڵەکان ئەوەندەیان گوێ هەڵخست ، بۆڕەی یەك چێریان نەبیست •• دنیا کپ بوو ••• مام خدر لەپڕ دەنگی هەڵبڕی « ئەوەتا دوو زەلام هاتن ؟ ڕەنگە یەکێکیان چەتۆ بێ »••

کوێخا ڕەسوڵ ، زوو دەنگی هەڵبڕی ئەی ئەوی‌تریان کێ‌یە ؟ •

مام خدر : ئەوەتا دوو زەلامن بەرەو ئێرە دێن •• دوو زەلامەکە چەند لە گوند نزیك دەبوونەوە ، خەست بوونەوەی ئێوارە وەختەکە پەردەی تارمایی بەسەردا دەدان ••

چەتۆ بەگوڕ هەنگاوی دەناو پیاوێکی تێكسمڕاوی کولەبنە ، بەشوێنیا بە هەناسەبڕکێ دەهات •• لەبەر دیوەخانەکەی کوێخا رەسوڵدا پیاوەکان هەموو دەوری چەتۆیان داو هەواڵی رشانەوەو نەخۆشییەکەیان لێ پرسی ••

شار لەتاو ئەو نەخۆشییە قرچۆڵ بووەتەوە، ئارامی لێ بڕاوە؛ خەڵکی ناو شار بەرەو گوندەکان هەڵ دێن ، چارە خۆ دەرباز کردنو هەڵ هاتنە ، ئەوەی بیەوێ خۆی رزگار بکات ئاو دیو دەبێ ••

ئەحل •• ویستی چەتۆ بەدرۆبخاتەوە کە گوایا نەگەیشتووەتە ناو شار بەڵام کە سەرو گوێلاکی چەتۆی دی ، کاکۆڵەکانی وەك خەڵکی شار تازە تراش کراون قسەی پێ نەکرا •• جگە لەوەش چەتۆ وتی : لەو برایە بپرسن کە خەڵکی شارەو لەترسی نەخۆشی هەڵهاتووە ئیتر ئەحل دەمی بەسرا ••

کابرای شاری لەمە گەیشتە گوند لەسەر سەکۆی مزگەوتەکە لەسەر لەپی ڕوو کەوت ••

هەر ئەوشەوە هەرکەس شرو بڕەی خۆی پێچایەوەو ڕووی لە دۆڵەرەش نا ••

کوێخا رەسوڵ خەمی لێ نیشتو شیرازەی هەموو شتێکی لەدەست پسا •• کوان ئەو هەرزەکارانە کە لەسەر نووکی پێ هەنگاویان دەهاویشتو گیزو گوڵەنگی جامەدانەکانیان باوەشێنی چاوە ئاڵۆش تێ

زاوەکانیان دەکرد ، کوێخا رەسوڵ ئەمەی دەووتو دەشیزانی هەریەك بەلایەکدا خۆی دەرباز کردووەو هەندێکیشیان بۆ خۆکوتاندن بەرەو شار چوونو نەگەڕاونەتەوە •• تا ئەوکاتەش ئەوەندەی بە چەتۆدا نەدەپەرمی •• ئەو هەواڵانەی کە لە شارەوە هێنابوونی دەتووت لە سنگی نووسراون •• خۆ ئەگەر ئەم پیاوە شاری‌یەی لەتەکدا نەهاتبایە لەوانەبوو گومان لە هەواڵەکانی بکرێ •• ئەی چوونو هاتنەوەکەی بۆ ناڵێی مەگەر لە وزەی چەتۆدا بووبێ ؟ دەنا تا ئێستا کەس نەیتوانیوە بەیانی بەرەو شار بڕواو ئێوارە بگەڕێتەوە ؟ بۆیە چەتۆ لەچاو کوێخا رەسوڵدا گۆڕا ، چەتۆیێك رۆیشتو چەتۆیەکی‌تر هات ••

پاش حەواندنەوە ، بانگی کردە لای خۆیو پێی‌ووت : ـ

ـــ ئەمشەو ئێمەیش دەڕوێن ••

ـــ ئەی ئاریانە ؟ بەجێی‌بێڵێن ؟! ••

ـــ تا ئافاتەکە نەمێنێ ئەوجا دەگەرێینەوە ؟! ••

ئەو شەوە ، چەتۆو ( نازدار ) ئەوەی پێویستو ئاودیو دەکرا پێچایانەوەو ئەوی‌تریان تاقەت کرد •• هێشتا سێ‌یەکێکی شەو مابوو ڕوەو شیوەڕەش ڕوویان نا •• نە کوێخا نە دایکی نازدار ئەو گوڕەی جارانیان نەمابوو •• تا چێشتەنگایەکی درەنگ ئەوجا گەیشتنە داوێنی هەورازە گەورەکە •• رۆیشتنێکی پالەوانانەیان کردبوو •• ئەگەر لەتاو گیان نەبێ ئەو دوڵە رەوگەی ئادەمی نەبوو ، ئەگەر ئازایەتی‌چەتۆیشس نەبوایە لەوانە بوو کوێخا رەسووڵو خێزانەکەی لە یەکەم تەنگەبەردا لە ناخی بێشەی ناو دوڵەکەدا نقوم ببوونایە •• ماندوو بوون لە لەشی چەتودا دەبووە خۆراكو ئاوداشتەکەری ئەو تاسەو ئارەزوانەی کە لە بێ دەرەتانیدا قرچۆڵ بووبوونەوە ، وا ئێستا بە بینینی نازدارو قسەشیرینەکانی بالا ـ

دەکەن ، کەی نازدار ئاوڕی لە چەتۆ دابووەوە •• کەچی وا ئێستا چەتۆ شان بەشانی لەم چەمە سامناکەدا ڕێگەی هاتو نەهات دەپێچێتـەوە ••• جاروباریش دەستەدامێنی چەتۆ دەبێ •• تۆ بڵێی نازدار ئێستا چۆن لە چەتۆ بیر بکاتەوە ، ئەم هەموو پاڵەوانی‌یەی کە دەینوێنێ بۆیان بە مافی خۆیان دەزانێو چونکە گلۆانی خۆیانە ؟!•• یان لە پیاوەتـــی خۆیو لەبەر چاوی کاڵی نازدارە ؟•• ئەو جۆرە خەیاڵانە لە مێشکی چەتـۆدا گینگڵەیان دەکرد • بۆیە چەتۆ لە گەڵ ئەوەشدا کە دەیویست ڕێگەکە لە یەك ساتدا لوولبدا حەزیشی دەکرد, هەتا هەتایە نەبڕێتەوە ، بـۆ ئەوەی پتر سەرنجی نازدار ڕابکێشـێ •• بـەدرێژایی هـەورازەکـە لە پێش ئەوانەوە چەند گوریسێك دەڕۆیشتو کۆڵەکەی دادەناو یارمەتی ئەوانی دەداو شتەکانی هەڵدەگرتـن ، گەلـی جـار نازدار لاقی لـە لێژایی‌یەکاندا دەترازاو ئەوەندەی نەدەما خـوار بێتـەوە ؛ چەتۆ وەك هەلۆیەك دەگەیشـتە سـەریو ڕزگاری دەکـرد ، لـە خلیسـکەکەی « بێسـەرە »دا ئەوەندەی نەمابوو بەربێتەوە ناو گەرووە تەنگەکە کـە ناوی نرابوو « چاڵی مردووان » • ئەوەی ئەم گەرووە هەڵیلووشـیایە ئیتر قەلو داڵ گۆشتەکەیان دەخواردو کەسیش دەستی بە ئێسکەکانـی نەدەگەیشت ؛ چەتۆ ئاگای لە سەختی ئەم شوێنە بوو ، بۆیە لەمە نازدار قاچی هەڵزەنی ، هاواری کرد • چەتۆ گەیشتە سەریو بە چنگەرووکی هێنایەوە سەر ڕێگەکە •• دایکی نازدار دوای بەخۆداهاتنەوە •• وتی•• بە حەق بێ نازدار هی چەتۆیەو ئەو ڕزگاری کردووە •• ئەم قسەیـە بوو بە دینەمۆیەك ئەوەندەی‌تر هێزی نایە بـەر چەتـۆ •• ئەمە بـەلای چەتۆوە گەلێ گرینگ بوو •• بۆیە لە دڵی خۆیـدا وتـی : ئـۆخەی ئەوە منم •• ناوم لە گەڵ ناوی نازدارا دەبرێ •• ئەو هەموو هەلدێرو ، پێچاوپێچو خلیسكو کەوتنو هەڵسانو نەواو دڵدانەوەو ماندووبوونو

ئارەق ڕشتن‌و تینویەتی‌و ترس‌و سام‌و دارو دەوەن‌و گژوگیاو دڕك‌و داڵە ئەوانە هەموو قسەکەی دایکی نازداریان لە گوێی چەتۆدا دووپات دەکردەوە ، لە چاوی دایکی نازداریشا کوڵکە زێڕینەی پاشەڕۆژی چەتۆو نازداری دەنەخشان ، لە دڵی نازداریشا دەبوون بە داوی هەورێشمین‌و قەیتانی ڕەنگاوڕەنگی خۆشەویستیان دەچنی .. لە چاوی کوێخا ڕەسوڵیشدا پەردەیان لەسەر مەعدەنی شاراوەی ڕاستەقینەی چەتۆ لادەدایەوە ..

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەیشتنە سەر لووتکەی چیا سەختەکەو ئاریانەی ئەم‌دیوو ئەودیویان لە بەردەما دیار بوو ، لە نزیك دینگە قوچ‌کراوەکەدا دانیشتن .. دینگەکە ئەوەند تکەبەرد بەتەنگەیدا درابوون وەك گۆر جوولەکەی لێ هاتبوو ، پاش هەندێ پشوودان ، چەتۆ هەڵسایەوە یەك تلەبەردی تێ‌سرەواندو داوای لە نازدار کرد کە ئەویش تلێك بەئەستۆیا بدا . نازدار هەر چەند هێزی تیا نەمابوو بەلام بێ‌دڵی چەتۆی نەکردو تلێکی هەڵ‌گرت‌و تا توانی بەناوقەدیا کێشا .. پاش پشوودان چەتۆ ڕووی‌کردە کوێخا ڕەسوڵ‌و وتی ئیتر من داوای ڕۆخسەتتان لێ دەکەم .. ئاگاتان لە خۆتان بێ ، وردە وردە بڕۆن بۆ ئیوارە دەگەنە ناودێ ! ..

کوێخا ڕەسوڵ : چەتۆ ئەوە دەڵێی چی ؟ ! ...

چەتۆ : گەورەم ، ئاریانەی خۆمان چۆن بەجێ‌بێڵم.. ئەو پیاوە شاریەی کە لەتەکما هات ،.چ ڕەوایە ، بە جێی‌بێڵم .. ئەی گاو گوتاڵەکانمان ..

نازدار : زەردەخەنەیەکی بۆ چەتۆ کردو ، وتی چەتۆ گیان بەجێمان مەیەڵە ..

چەتۆ : ئەی ئاریانەی خۆمان •••

نازدار : تووشی نەخۆشی دەبی ••

چەتۆ : تووش‌نابم •• خۆم دەپارێزم ، هەر زانیم دەمگرێتەوە ڕوودەکەمە ناو ئەو چەمو دوڵە •• ئەمەی ووت‌و تێ‌ی‌تەقان‌و بەرەودوا گەڕایەوە ••

ئاریانەی ئەودیو ، بووبوو بەژێر لافاوی خەڵکەکەی ئەم‌دیوەوە؛ لەوێش وا دەنگ بوو کە نەخۆشی‌یەك پەیدا بوو لە ڕشانەوەکەی ئەم‌دیو گران‌ترە کە نەخۆشی سك‌چوون بوو ، تووشی هەرکەس بهاتایە تەڕی لە لەشیا نەدەهێشت‌و هەمووی دەهێنایە خـوارەوە •• کوێخـا ڕەسوڵ سەرگەردان بووبوو ، لە هەر شوێنێك دانیشتایە سکالای خۆی دەکردو دەیویست بە خەڵك بڵێ : لە شوێن خۆیا ، خانەدان بووەو خەڵك خزمەتی کردووە ، ئەوەی تۆزقالێ دڵێ خۆش دەکرد ئەو جەنجاڵە زۆرە بوو کە سەدان ئاغاو سەردارو کوێخای وەك ئەوی تیا خنکابوو ••• داخی ئـەو هەرزەکارانە بۆ نالێ‌ی کە لغاوی هەرزەیی‌خۆیان لەناو تێکەو لێکەی ئەو خەڵکەدا شل‌کردبوو ، لە هەر لایەك ئافرەتێك دەرکەوتایە ، سەد ملی بۆ قیت دەبووەوە •••

نازدار هـەرچەند تازە چاوی کرابووەو ئەوەندە تێکەڵاوی خەڵك نەبووبوو ، چی وردی ئەو خەڵکـە دەبـووەوە یەکێکی بـەغیرەتی وەك چەتۆی بەرچاو نەدەکەوت •• « عەبە خەنە » ئەورۆژە بـە تەگبیری مام حەمکۆ هاتبووە ئاریانە بۆئەوەی هەر لەدوورەوە هەواڵێکی ئەو خەڵکـە بزانێ ، ئەورۆژە تا درەنگێك بەناو خەڵکەکەدا گەڕا ، هـەر ئـەورۆژە گوێ‌ی لێ بوو کە بە خەڵکەکـە رادەگەیێنرا کـە « جەنابی قایـمقام » دەیەوی لەگەڵ خەڵکەکەدا کۆببێتەوە وقسەیان بۆ بکات ••• دەمێك بوو

« عەبە خەنە » لەو مەراقەدا بوو کە رۆژێك لە رۆژان چاوی بە قایمقامێك بکەوێت ، زۆر جار حەولی دابوو بچێتە شار بۆئـەوەی قایمقامێـك ببینێ بەلاَم بۆی نەلوابوو ، بۆیە بە باشی زانی ئەم دەرفەتە لەکیس خۆی نەدا ، هەم قایمقام دەبینێو هەم بەلْکو گوێی لە راو تەگبیرێ دەبێ ..

خەلْکەکە هەموو لە گۆڕەپانەکەدا خڕبوونەوەو چاوەڕوانی هاتنی قایمقامیان دەکرد ، عەبەش بەرامبەر بـەو شوێنـەی کە قایمقـامی تیـا رادەوەستا شوێنی خۆی گرت .. گوێیلێبوو خەلْکەکە باسی قایمقامیان دەکرد ، یەکێك دەیووت کوڕی یەکێکە لە ئاغاکانی ئەوناوە... یەکێکیتر دەیـووت .. چەند جار بە گوێی خۆم گوێم لە باوکی بووە پێیوتووە بۆ ئاغایەتی دەستنادەی .. یەکێکیتر دەیووت ... هـەتا مەکتـەبی تەواو کرد سەد جار باوکی چووە لای پیاوە گەورەکان .. یەکێکیتـر دەیووت ئەمڕۆ هەم ئاغایەو هەم قایمقام .. دیار بوو خەلْکەکە قایمقامیان دەناسی .. لەگـەلْ ئەوەشـدا .. ئێ .. بەلْکو هـەوالْێـکی خۆشـس ، چارەیـەك ..

قایمقام زۆر دلْخۆش بوو کە ئەمڕۆ بەرامبەر بەو هەموو حەشاماتە رادەوەستێو خۆی دەبینێتەوە .. لە دلْی خۆیا دەیووت بریا ئێستا باوکم چاوی لێم دەبوو .. من هەم ئاغـامو هەم قایمقـام ، ئەگـەر باوکـم بەبێگەواهینامە ئاغا بوو ، من گەواهینامەی هـەم ئـاغایەتیو هـەم قایمقامیشم پێیە .. ئەوەی تۆزێ نارەحـەتی دەکرد ، ئـەو یـەك دوو مامۆستایە بوون کە لە هەموو قسەیەکیان دەکولْیـەوە .. ئەوەنـدی پێ نەچوو جەنابی قایمقـام دەرکـەوت .. « عەبـە خەنـە » چـاك لـێی ورددەبووەوە ، ئەو وێنانەی کە سالْەها بوو بۆ قایمقامەکانی کێشابوون هەروەك فلیمی نەشۆراوە بە دەرکەوتنی شانو شـەوکـەوتی قایمقـام

سووتان •• پیاوێکی کورتە باڵای دەمو چاو ڕەقەڵەی چیرە باریك بوو••
قایمقام ڕووی کردە خەڵکەکەو وتی :

« خەڵکینە ، من قایمقامی ئەم ئاریانەم ، ڕەنگە بزانن هەر شوێنێ بوو بە قایمقامنشین ، مانای وایە پیاوی گەورەیان لێ هەڵکەوتووە ، دنیا بەبێ‌پیاوی گەورە نەبووەو نابێ •• بە ناوی ئەوەی منی کردووە بە گەورەی ئێوە پێتان دەڵێم ؛ دوعای خەیر بکەن ، بپاڕێنەوە بەڵکو ئەمە خوایە ، خوا نەخۆشی‌یەکەی ئەودیوتان لەکوڵ بخاتو بگەڕێنەوە شوێنی خۆتان •• » هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو ، عەبە خەنە هەستی بە دڵەکزەیەك کردو خەریكبوو بڕشێتەوە، لەوەش دڵنیا بوو کە دڵەکزەکەی ڕشانەوەی نەخۆشی نەبوو •• بۆیە بەناو خەڵکەکەدا ڕێی خۆی شەقکردو ویستی گۆڕەپانەکە بەجێ بێڵێ •• لە وەختی کشانەوەیدا ، لووتی بە لووتی کوێخا ڕەسوڵەوە بوو •

کوێخا : عەبە ؟ ! • ئەوە لێرەی ؟ ••
عەبە.: کوێخا ؟ ! • ئە مڕۆ هاتووم وادەگەڕێمەوە ••
کوێخا : بۆ کوێ ••
عەبە : بۆ ئاریانەی خۆمان ، بۆ لای مام حەمکۆو چەتۆ •••
کوێخا : ئەی نەخوشی‌یەکە ••• ئەی ئافەتەکە ؟••
عەبە : ئێمە •• دەزانین چۆن خۆمان لەو ئافەتە رزگار بکەین••
کوێخا : عەبە گیان پەلە مەکە ئێشم پێتە ••
عەبە : پەلەمەو دەبێ ئەم‌ئێوارە بگەمەوە لای مام حەمکۆو چەتۆ •• « بە گورجی تێی تەقانو داوێنی شاخە سەختەکەی گرتە بەر » •••

# فورات و چەند گۆرانی یەکی غەمگین

شێرکۆ بێکەس
بۆ « س »ی شاعیرو هاوڕێم

**١ـ ماسیگرە تەنیاکە**

لە ئاوی بەر زەردەپەڕدا
بەلەمەکەی لەدوورەوە
سینی یەکی درێژکۆلەی
لووت تیژی لێوار زێڕینە •
لە ناکاودا •• وەك بخلیسکێ
وەك قووت بچێ
لە لێژایی شەپۆلێکدا ،
دائەچێت و •• لەپڕیشدا
وەك هەڵیدەن
سەر « فورات » ئەکەوێتەوە •
ئەی ماسیگرە تەنیاکە !
تۆ لەنێوان
شەپۆلی تووڕەو هێمندا
خەمێکی تەمەن درێژی •
منیش لێرە •• لە کەناردا ،

دار خورمایەکی تەریکی کورتە باڵام
تۆزێکی‌تر •• کە تاریکیی چڕتر بۆوە
درەنگانێ کە تۆ نووستی
ئەوسا خەمی تۆش‌و فورات
بە جووت ئەفڕن‌و دێن بۆ لام •

## ٢ـ مامزی ماندوو

پەنجەکانی « با » بزێون
قژی بۆ دواوە ئەفڕێنن
پەنجەکانی « بـا » نماوین
ئاونگ لە چاوی ئەزێنن •
لە فوراتەوە دێتەوە
چاوم لێیە :
بە پەلە پەڵەی هەتاوی
دارستانی ـ دار خورمادا ـ
بە لارەلار ، تێ‌ئەپەڕێ •
نیوەی لەشی لە سێبەرداو ،
نیوەکەی‌تر ••
تیشکی لەسەر هەڵ‌ئەپەڕێ •
بەڕێوەیە • •
لارە •• لارە
لە مامزی ماندوو ئەچێ •
هەردوو دەستی سەتڵ گرتووی
شل‌ئەبێت‌و بۆ چەند ساتێ

وچان ئەگرێ •
ئیستەکە ڕێك بەرامبەری
ڕاوەستاوە •
ئەڵێی گوڵە هێرۆی ئاڵی
دڵۆپ لە ڕوو هەڵپرژاوە
ئەی ژنە دڵ •• غەمگینەکەم :
ئەوینی تۆو ئاوی فورات
نەبوونایە ••
هەرگیز •• هەرگیز
من ئەم شیعرەم
بۆ نەئەهات •

### ٣- هاوڕێی پچووك

« حسون » منداڵێکە لاواز
باریك •• سەرخڕ
وەك مارماسیی فورات وایە
ڕەنگی وەك خورمای خەستەوی
چاوی وەکوو ترێ ڕەشکە •
« حسون » ئەی هاوڕێی پچووك !
ڕووی خۆڵاوی خۆتم تێکە
تەماشام کە
تۆ لە چاوتا
خەمی ئێجگار :
گەورە گەورەی تیایــە •

## ٤ـ شـەوی حکایـەت

وەك ئافرەتێکی زراو چوو
« با » ڕانەکاو ئەزریکێنی •
قژی درەخت ئاڵۆزکاوە •
شەپۆل چاوی ئەنووقێنێ •
لە ئاسمانی خۆڵەمێشیی سەر فوراتا
وەکوو لۆکە ،
شی ئەبنەوە پەڵە هەورو
وەکوو پەڕی کۆتری سپی ،
باڵ کراوی فڕکەکردوو
بڵاو ••• بڵاو
دێنە بەرچاو •

ئیستە دڵم ،
چون هەنارێکی گوشراوە •
ئەمشەو لەبەر تەنیا زۆپای
ژوورەکەمدا •
بەرامبەر دایکە پیرەکەم
دائەنیشم •
چاو ئەبڕمە چاوی کزی •
ئەمشەو شەوی حکایەتە
« لاس و خەزاڵ » میوانمانن •
گوێم بۆ دایکم ڕاگرتووە ،
کە « لاس » ئەدوێ
کە « لاس » ئەڕوا :

دۆڵ بە دۆڵو
شاخ بــە شاخو
ڕەوەز • • ڕەوەز
من لەگەڵیام •
وەختێ وەنەوز لە ناوچاوما
ئەکەوێتە باڵەفڕێ
هێشتا فورات ئەناڵێنێو
لەولاشەوە ••
« لاس » هەر ئەڕواو ڕێگە ئەبڕێ •

## ٥ـ دراوسـێ

« أم سعد » •• دراوسێمانە
وەك دووکەڵ کێش ،
تەمەنی ئەو ڕەشداگەڕاو •
دەمو چاوی :
نانی سووتاو •
باڵای لە لقە دار خورمای ،
وشکەوەبووی ،
پەنا تەندوورەکەی ئەچێ •
ناسۆرێکەو ئازا ئەژی
هەر یەك شتن
دەستو پلو کۆڵەوژی •
وەکوو ڕۆژگاری بیابان
ئەمیش لەبەر کڵپەو گڕا

سیمای داخە •
وەکوو شەوگاری بیابان
ئەمیش قسەی خۆش‌و فێنك
وەکوو سروەی ڕەزو باخە •
وەك « ناعوورەکەی » ئەوبەرمان
چۆن خول ئەخوا
قەت ناسرەوێ
ئەم « أم سعد »ەش
ئازارێکە بەپێوەیەو ••
کەس نازانێ
چوەخت ئەنوێ !

## ٦ ـ لە کەناردا

لەناو پەنجەرەی هەورەوە
مانگ وا سەری دەرهێناوە
هێدی •• هێدی
زیو پرژێنی قورات ئەکا •
تاڵە تیشکی هەڵەرزیوی ،
بنی ڕووبار
وەك گەردانەن
وەك پۆیلانەن
گوڵ‌و گوارەن •
وەك ژنەکەم ، شەوێکە : مات •
کز دانیشتووین

لەسەر لمی هێشتا گەرمی
گوێ کەناریش
کچە گەورە چاوڕەشەکەم
دوانزە ساڵان •
تریفە ئەیدا لە قژی
کڵاوزەڕی ئەکاتەسەر •
بە چیچکانەوە خەریکە
یەکە •• یەکە ،
هێلکەی تەڕی « شەیتانۆکە »
ئەچنێتەوە •
ئەوەتا وا :
کچە گەورە چاوڕەشەکەم
لەبەر خۆوە
وەکوو چەپکە گوڵێ ژاکاو ،
گۆرانییەك ئەدا بەدەم ، فوراتەوە :
« هۆ کوردستان ، هۆ ژیانم »
من و دایکی لە یەك کاتدا
بەیەکەوە سەر هەڵئەبڕین
بە بێ ئەوەی پێ بزانین
بێ دەنگ •• ئەگرین ! !

# کاتی بێدەنگی دەدوێ

رەزا سەیدگوڵ بەرزنجی

ئەوەندە لەسەر کورسی‌یە ڕەق‌و تەقەکە مابۆوە لەشی سڕ ببوو .. چوار دەوری تەنرابوو .. هەورێکی بۆری چڵکن بەری دڵی گرتبوو .. زنجیرە قسەیێ لە هەناوی‌دا هەڵقوڵا .. گەیشتە سەر زاری .. ئەوەندە نەمابوو گیانیان بەبەردا بکا ، ئیشارەتی قسە نەکردنیان بۆ هەڵواسی ..، قسەکانی قووت‌دایەوەو لە ناخی خۆیدا وتی :

ئەی گوایە زمانم بۆچی‌یە ..!؟

وا بە ناخی خۆیدا شۆڕبۆوە سەیرانەکەی ئەوسای هاتەوە یاد کە بە سەربەستی دەستی لە بن‌گوێی نابوو بۆ گۆرانی تێ‌هەڵکردن :

کە دەڵێن ئیمڕۆ دەشت‌و کێو شینە
چەندە مەلبەندی ئێمە شیرینە
بچۆ سەر گردی یارە بیبینە
لە جیهاندا گوڵێکی ڕەنگینە

یەکێکیان نەقورچەیێکی خێواندە قەبرغەی‌و پێی‌وت :

— بۆت نی‌یە تەنانەت پەساپۆرت بۆ ناخی خۆشت ببڕێ .

زمانی بێدەنگی زمانی ناوەوەی بوو ، مەیدانێکی بەربەرەللا بوو
کە دەیتوانی تێیدا بدوێ •

دیسان بە ناخی خۆیدا شۆربۆوە :

— با دەمم بۆگەنی بێ •• تا پەنجەکانم بجووڵێن پەکم لەسەر زمان ناکەوێ ، چەندەها نامەی دڵداریو وشەی سەوزم پێ نووسیوە •

یەکێکیان چاوی بە پەنجە جووڵاوەکانی کەوتو تێی خوڕی :

— پەنجەکانت مەجووڵێنە ، ماسولکەکانی هیلاك دەبن •

تەماشایەکی کرد ، کەمێ خۆی بەسەر پشتی کورسییەکەدا شکاندەوە ••، بۆ چەند جارە بە ناخی خۆیدا شۆڕبۆوە :

— کە ئەمانەش وەرین هەمیسان پەکم ناکەوێ ، تیشکی چاوم هەموو شتێکیان تێدەگەیەنێ ، هەزار ڕازو نیاز بەهۆی چاوەوە لەدایك بوون • کە ڕۆشنایش لە چاومدا نەما ئەوە دڵم دەکەم بە پەڕە قاقەز •• بە چاپخانە •• هەرچیم بوێ •• چوەسیەتێکیشم هەبێ پیت بە پیت •• وشە بە وشە ، ڕستە •• ڕستە •• دایدەڕێژم ، تاکە ئاواتیشم ئەوەیە کە مردم فریشتە خێرخواکان بێنو هەرچیم لەناو دڵمدا جێهێشتبێ •• هەڵی بهێنجنو بێگەیێننە دایکم •

پژمینێ لێی تێکدا ••، چاوی بڵندکرد روانینی کەوتە سەر تابلۆکەی بەرامبەریو لە دڵی خۆیدا وتی :

— ئای چ ئەسپێکی کەحێلەیە ••! بزانە ماسولکەکانی هەردوو دەستی چۆن دەرپەڕیون ، دەڵێی تێك هەڵکێشراون •• تەماشا ••! چۆن ڕەسەنانە هەنگاوی هاویشتووە !•

چاوی لەسەر ئەمەیان ترازا •• ڕوانینی لەسەر تابلۆکەی‌تر گیرسایەوە •• بۆی‌شۆڕبۆوە :

— ڕاستی بێ شتێکی وای لێ تێ‌ناگەم •• ئەوەی دەرکی پێ‌بکەم ڕەنگی سوور زاڵە بەسەر هەموو ڕەنگەکانی‌تری نێو تابلۆکەدا •

کوژانەوەی کارەباکە هەموو تەنەکانی لەبەرچاو ون‌کرد •• تاریکیەکی ئەنگوستە چاو خۆی کرد بە ژووردا • کاتێ کارەباکە گیانی بە بەر تەلەکاندا کردەوە ، ڕووناکی دەستی لە خن‌خنۆکەی تاریکی نابوو •• کورسی‌یەکی بەتاڵیش دەوری تەنرابوو •• بۆی‌چوون ، گەڵایێکی سەوز لەسەر کورسی‌یەکە کەوتبوو ، وەرچەرخانەوە تابلۆی ئەسپە کەحێلیش نەمابوو •

١٢ - ٧ - ١٩٧٩

# ڕێگاکەت سەختە بەڵام تۆش ڕێبوارێکی کارامەیت

عمر محمد اسماعيل

تۆ دەتزانی ! ئەگەر سوارێ :
خزایە نێو گێژەلووکەی کۆڕی کاروان
بوو بە یاری باریکەڕێو تویشووی شەوان
دەبێ هانکە هانکی هەوراز ،
گەلێ جاری یەخەگیر بن
تا لە قەدی نشێوێکی پشووبەخشا
دەسێتەوەو
هێدی هێدی دێتە خوارێ

تۆ دەتزانی ! وەرزە بەهار
تا نەورۆزی دایکی دەزێ
دەبتە کۆرپەو پێ لە پەیژەی ژیانی دەنێ
لە بن باڵی سەد زستانو
خەمو هەوری تریشقەدار حەشار دەدرێ

تا ساماڵی تین‌و ئارام دەیخەملێنێ
ئەوسا ڕۆژێ لەبڕێکا ڕزگار دەکرێ

* * *

تۆ دەتزانی !
ئەگەر سەودای ئاسۆی دوورت بێتە سەری
بۆ بەرۆك‌و مەمکی ئاگر دەستت بەری
تا دەوەنی ئارەزووی خۆت
یەك یەك پەلکی هەڵنەوەری
چرۆی حەزی چ‌دەروونێ لە سێبەری
بڕکی کەسك‌و ڕەنجی تۆدا بەرناگری

* * *

وەرەو بڕۆ ..
شەقاو شەقاو گلۆرەی ئەو تەم‌ومژە
هەڵکەرەوە ،
دارو بەردیش بپشکنە
بنار بنار هەرچی هەیە لێکی‌بدە
تاکو قاسپە خوێنەکانی هەموو کێوی
مرازی تۆ
لە باخەڵتا ،
دەبنە کەوێکی ئیسك‌سووك‌و دەستەمۆ

* * *

خۆ تەنیا نیت
دڵنیا بە تۆ تەنیا نیت
هەرچەند جارێ
تۆ شاکارێ
دەسازێنی
گیانی هەموو ئەوینەکان
دەبنە خوێنو دەچنە لەشی کچە بێریەك
لە بەردەمی شۆڕەشوانێ
لەنجە دەکاو دێتو دەچێت

---

ئای ! چەند سەختو بەئازارە مرۆ وابژی هەرچی
بەدەوروبەریایە بە حاڵی خۆی بمێنێو نەگۆڕێ •
ئەمە ئەگەر گیانیشی نەمرێنێ ، ئەو ئازارەی نەگۆڕانو
لەسەر حاڵی خۆ مانەوەی شتەکانی دەوروبەری ،
تا ئەمرێ هەر سەختتر ئەبێ •

**گۆرکی**

---

# یەک ٠٠دوو وشە
# دەربارەی ئەدیبێکی شۆڕشگێڕ

**هـەژار سـورمێ**

کردوویە بە کوردی

کێ بێ لە ئێمە غەسسان کەنەفانی نەناسێ‌و لای کەمی نوسراوێکی ئەوی نەخوێندبێتەوە ؟ بێ‌گومان هەموومان ئاشناینیو ئەزانین هەر کە نـاوی ئەدەبی بەرگری فەلەستینی هاتبێ ئەو پێشەنگ بووە •

نووسینەکانی غەسسان بۆ نوسەرو ئازادیخوازەکان دڵئەنگێون ، داستانی قارەمانێتین، چریکەی عاشقە دڵپاکەکانن، زەمەندو زەنوێرن کە چەند تێیدا بێن‌و بچن ئەوەندە لە ئازارەکانیان دەگەن • بۆ ناحەزانیشی کەویە ـ بەفرن ، رەوەزو ( ماە )ی سەختن ، ئەو بۆمبایەن کە بەسەر شارە کرمنەکـەی مێشـکیانیـدا دەڕژان ، تـا ئـەو رادەیـەی خـۆیان لەبیردەچوەوە ، هـەر بۆیەشـە ئـەو قەڵەمـە پیرۆزەی کـە غەسسـان پێیدەنوسـی هیچی کەمتـر نییە لـە لولـەی ئـەو تفەنگـەی کـە پێشمەرگەیەکی فەلەستینی ڕووبەرووی دوژمنانی دەکاتەوە ، غەسسـان دەنگی دلێرانەی خۆی ئاوێتەی سەدایە بێ‌ئاوازەکان‌و بەرخۆلە هەتیوو بێ‌نازکەوتوەکانی‌تر دەکرد ، ئەو تێکۆشەرە بوو کە هەر لە منالیەوەو لەوکاتەوەی هەستی بە زانینی ڕاست‌و چەپی خۆی کرد ، دەست‌لەملانێی

ولاَتەکەی بووو دەیویست لەئەنجامی شەهیدبوونی ئـەو هەمـوو لاوو ساوایە بێ گوناهانەدا ، لەئەنجامی ئـەو برینانەی کـە هـەر لە سـۆتو سوێدانو هێشتا گۆشتەوزونیان نەهێناوەتـەوە ، لەئەنجامی ئـەو کەفو کوڵانەی کە هێشتا دانەمرکاونەتەوەو زیاتر لە هەڵچوونداں ، لەئەنجامی خوێنی ئەو خۆیندکارانەی کە ڕژانە سەر مێزی پۆڵو ئەو سەرانـەی وەبن تاشەبەردان کەوتن ، لەئەنجامی لە کەل ئاوابوونی ئەسـتێرەکان ، ئەمجارەیان رۆژهەڵبێتو ئەمجارەشیان ئەم گەردوونە قەرزی خـــۆی بداتەوەو بێوەفا نەبێت دەرهەق ئەم کارەساتە تراژیدی یە جەرگبرە •

شەهیدیان کرد ، لاشە بێ گیان بوو ، نووسینەکانی هەر زیندوون ، ئێستایش نووسینەکانی بە دژوارترین رێگا ، سەخت ترین چیا، بچوکترین کەلەبەردا دەڕواو دەیانگاتێ ، گیانیان دەتاسێنێ ، تارماییەکەیشی لەگەڵ هەموویاندایەو هەموو ڕۆژێك چەندەها دێوەزمە ئەتۆقێنێ کە ئەو بـــە دێوەزمە ئەزانن • •

غەسسان بەرەو نەمـری کۆچـی کرد ، بـەلاَم گەلی فەلەستـین غەسسانی لێ نابڕێو غەسسان ئاساییەکان لە گەلێ سووچی تری دونیادا هەن، لەو جێگایانەی کە مافیـان لێ زەوت کراوە ، لەو شـوێنانەی کـە هەقیقەت ئەخنکێنرێ ، لە ئـەفریقیـای قولەرەشـــدا ، لە هەر شـوێنێ کەووکۆتر لە زیندان توند بکەن •

غەسسان لەو ناوە بێناوەرۆکانە دوورە کە پابەند بە هەندێ مەسەلەی دیاریکراون ، چونکە نوسیارەکانیان وەك بڵقی سـەر ئاوکەوتوو وانو قەلەمەکانیان زوو دەشکێ • غەسسان گەرچی لاشەکەی سرو بێ گیان بوو بەلاَم ئێستاو لەمەودوایش یەکێکە لە سەربازە ناسراوەکان چونکە لەپێناوی بیروباوەڕێکا تێدەکۆشا ، رابەری یەکێکی وەك « مەحمود دەرویش »

بووو هانی‌دەدان وەك خۆی شیعرەكانیان ڕەنگدانەوەی تێكۆشان‌و خەبات‌و ڕووبەڕووبونەوەیان بێ بەرامبەر دوژمن ، هەر ئەویش بوو بۆ یەكەمین جار ناوونیشانی ( شعر المقاومة ) ی بۆ شیعری شاعیرە خۆ ڕاگرتوەكانی فەلەستین دۆزیەوە •

گەلی بێ‌بەش‌كراوی فەلەستینی‌و خەڵك‌و خوای‌تری وەك ئەوانیش غەسسان لە زارەكانیاندا دەبیننەوە ، لە دەست‌وپێی شەتەك‌دراوی زیندەبەچاڵ‌و لە خوێن گەوزیوەكاندا ، لە پاداشتی شەهیدەكانی‌تردا دەدۆزنەوە ، وەك هێمۆگلۆبین لەنێو برین‌و زامی ساڕێژ نەبوودا ئەبینن ، لە پێخوستی ئەو لاوە بەجەرگانەی كە بەرگەی هەموو ئازارێك ئەگرن بۆئەوەی ناوی دەیەهای وەك غەسسان لەسەر دیوارو بڵاوكراوەكاندا زیندوو بكەنەوە كە ڕەمزی خۆبەخت كردن‌و ئازایەتی بوو ، گەر گوێ لە كەنەفانی بگری وەك نوێنەری تەواوی گەلی فەلەستین دەدوێ‌و دەڵێ :

[ قەلبی من گەر چەشنی لالە بێت‌و نەوتی تێ‌بكەن
ئاگری دوژمن بێتە گیانم وەك چرا من پێ‌بكەن

لەت‌لەتی گۆشت‌و سوقانم ، یەك‌بەیەك خوێی تێ‌بكەن
بێ‌ترس من دێمە مەیدان ، حوكمە ئازادیم دەوێ ] •••

كەنەفانی لە ٩ی بانەمەڕی ١٩٣٦دا لە شاری ( عەككا ) چاوی بە دونیا هەڵێناوە ، هەر لە هەڕەتی لاوێتی‌دا بوو كە دەستی‌كرد بە تێكۆشان‌و ئینكەبەری دەگەڵ دوژمنان ، لەپاش كارەساتەكەی ١٩٤٨ بارگەی غەریبی‌و خەفەتباری‌یان بەرەو لوبنان تێك‌نا •

لە ساڵی ١٩٥٦دا بۆ یەكەمین‌جار دەستی‌كرد بە كاری ڕۆژنامەنووسی‌و هەروەك بەرهەمە ئەدەبی‌یەكانیشی هەر لەوكاتەوە دەستی

پێ کرد ، هەر لەو ساڵەیشدا دوای ئەوەی لە ڕێگەی دەرزی (هونەر)ەوە خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە قوتابی‌یە فەلەستینیەکان کرد لە شام ، بەرەو کوێت کەوتە ڕێگا ماوەیەکیش لەوێدا لە خوێندنگە ناونجی‌یەکاندا ڕەسم‌و ریازەی دەگوتەوە •

لە ساڵی ١٩٦٠ بۆ جارێکی‌تر گەڕایەوە بەیرووت‌و بووە «بنووس» لە ڕۆژنامەی « الحرية » کە ئەوکاتە دەردەچوو ، لەدوای سێ تاقە ساڵانیش بوە سەر نووسەری هەمان ڕۆژنامە ، جگە لەوەی لە چەند ڕۆژنامەی‌تری وەك «الانوار»و «الحوادث» کاری کردوە •

لە ساڵی ١٩٦٩یشدا دەستی کرد بە دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی‌تر بە ناوی «الهدف» • ئەم ڕۆژنامەیەش زۆر بە چوست‌و چالاکی دەردەچوو و چاونەترسانە واقیعی گەلی فەلەستینی‌و چالاکی‌یە رامیاریەکانی پێشمەرگەی فەلەستینی دەخستەڕوو و گەلێك جارانیش ئاوڕی لە گەلە لیقەوماوەکانی‌تر دەدایەوە •

غەسسان لە کات‌ژمێری دەوپەنجا خولەك‌و لە ٨ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٧٢ لە ئاکامی ئەو پلانە مان‌و نەمانی‌یەی دوژمن ، خۆی‌و «لەمیس»ی خوشکەزای شەهیدبوون‌و بوونە داستانی پاڵەوانێتی‌و فیداکاری •

کەنەفانی نموونەی بنووسێکی شۆڕشگێڕی سیاسی‌و ڕۆمان‌و چیرۆك‌نوس‌و ڕەخنەگرێکی لێهاتوو بوو •• لەو تەمەنە کورتەی کە تەنها (٣٦) ساڵ بوو توانی گەلەکەی بە جیهان بناسێنێ‌و توانای خۆی لە نووسیندا دەربخات ، هەر لەبەرئەوەش بوو خەڵاتی « اصدقاء الكتاب في لبنان »ی پێ بەخشراو لە ساڵی ١٩٧٥یشدا خەڵاتی «لوتس»ی نوسەرانی ئەفرۆئاسیایی پێ بەخشرا • تاکو ئێستا چوار کۆمەڵە چیرۆك‌و

چوار ڕۆمان‌و سێ ڕۆمانی تەواو نەکراوو سێ شانۆنامەو پێنج لێکولینەوەی بە کتێب نوسیوە کە یەك لەم تۆژینەوانەیش «شۆرشی ١٩٣٦ ـ ١٩٣٩ »ەیە لە فەلەستین ، جگە لە چەندین وتارو نوسین‌و ڕۆمان کە بە زنجیرە لە ڕوپەڕی ڕۆژنامەکانی وەك « الهدف »و « المحرر »دا بلاوی کردونەتەوە •

هەزار سلاو بۆ گیانی غەسسانی پێشمەرگە ، ئەو مرۆڤەی مەرەکەبی پێنوسەکەی وەکو خوێنی ئەو فیداکارە وابوو کە داری ئازادیی پێ ئاو ئەدا •

---

ئێمە کۆشکێك نین بڕووخێین‌و ، مەسەلەکەمان بەوە دوایی بێ •

**د• جۆرج حەبەش**

پێشەوای بەرەی میللیی ئازادیبەخشی فەلەستین

★ ★ ★

ئێمە ڕانەمەڕ نین بە پایۆڕو ئۆتۆمۆبیل ئەملاو ئەولامان پێ بکەن •

**سەلاح خەلەف ( ئەبووئەیاد )**

ئەندامی کومیتەی ناوەندیی بزووتنەوەی ئازادیبەخشی‌فەلەستین

---

# بەهەشتو خاك

**جەلال مەحمەت خۆشناو**

کە منالّ بووم
بەرەو مزگەوت
بۆ فێربوونو خوێندن ئەچووم
تا مامۆستا
دەرسی قورئانم فێر بکا
لە ئامۆژگاریم تێر بکا
رۆژێکیان مەلا ئەی فەرموو
رۆلە ئێستا
یەكو یەك با بکانە دوو
مەکتەب تەنیا نابێتە هۆ
گەر ئایین نەخەیتە ئەستۆ
لە رێی کردەوەی چاك بمرە
رێزی دایكو باوکت بگرە
چاك بزانە ...
بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە ! !
بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە ! !
من بەو واتەیە حەپەسام
پەلە بووم بگەمە مەرام
بە ڕاکردن چوومەوە مالّ
بەبێ پرسو بەبێ هەوالّ
بە دەستو برد

یەکسەر ژێر پێی دایکم ماچ کرد !
دایکم پێی ووتم : ڕۆڵە گیان
ئەمە چیتە هەی بە قوربان
لێت گۆڕاوە ؟
چی قەوماوە ؟ !
خەڵك ئەنووسێتە زوڵفان
ماچی گەردنو ڕوومەتان
بە کوێرایی چاوی دوژمن
چۆن ئەنووسێیتە ژێر پێی من ؟ !
گوتم : دایـە ...
هەموو شتێك بە بڕوایە
مەلا دەڵێت :
نیشان دراوە لەم قورئانە
بەهەشت لە ژێر پێی دایکانە
هەر بۆیە نووسامە ژێر پێت
ببوورە دایە دەمەوێ
چاوم بە بەهەشت بکەوێ !
گوتی : رۆڵە ...
مەبەست ژێرپێ خاكو خۆڵە
بۆ ئێمە ئەو خاکە جوانە
کوردسـتانە
لەو کاتەوە ....
سەرم لە پێناوی دایکەو ،
ماچم لە خاك نابێتەوە
نابێتەوە !!

# له دانیشتنێكدا له‌گه‌ڵ
# ( خالید دلێر )ی شاعـیرو هونه‌رمه‌ند

**مومتاز حه‌یده‌ری ئاماده‌ی كردوه**

شاعیرو هونه‌رمه‌ند ( خالید دلێر ) شاعیرێكه هاوڕێی هه‌میشه‌یی ( ئـاوازو گۆرانـی )ش بـووه ، هـــه‌ر له‌به‌رئـه‌وه لـه‌زووه‌وه ویـستم گفتوگۆیێكی له‌گه‌ڵ سازبده‌م تا ئه‌وه‌ی كه به‌رێكه‌وت مامۆستا خالید هاته هه‌ولێرو ئیتر ئه‌م دانیشتنه‌مان بوو كه زیاتر له‌وه ده‌چێ كۆڕێكی بچكۆلانه بێو منو كاك ( نه‌ژاد عزیز سورمێ ) به‌شداریمان تێدا كرد • شایانی باسه ئه‌م دانیشتنه تاراده‌یه‌ك له هیكرا بووو حه‌زیشمان ده‌كرد به‌پێزترو به‌ربلاوتر بێ به‌ڵام له‌كاتی خۆی سه‌باره‌ت به چه‌ند هۆیێكی تایبه‌ت بـه مامۆستا خالید خۆیه‌وه له‌كورتیمان بڕییه‌وه • ئه‌مه‌و ده‌مه‌وێ كه داوای لێبوردنیش له مامۆستا خالید بكه‌م به دواكه‌وتنی بڵاوبوونه‌وه‌ی • كاتی خۆی له‌سه‌ر كاسێتێكی موسه‌جیله تۆماركرابووو منیش به‌بێ ده‌سكاری ده‌قاوده‌قی قسه‌كانم خستۆته‌وه سه‌ر كاغه‌ز •

**مومتاز حه‌یده‌ری**

**مومتــاز :**

مامۆستا ! ئێمه له‌م دانیشـتنه‌ماندا كه زیاتر لـه‌وه ده‌چێ كۆڕێـكی بچكۆلانه بێو كاك ( نه‌ژاد عزیز سـورمێ )ش به‌شـداری تێـدا ده‌كـا

هیوادارین بگەینە هەندێ ئەنجـام دەربارەی ئاوازو گۆرانی کـوردی •
ئومیدیشم وایە کە بەئاشکرا رای خـۆتمان دەربارەی باری ئـەمرۆی
گۆرانیی‌و ئاوازی کوردی بێ‌بلێی •

**خالیـد :**

ئەمن زۆر سوپاسی برایەتیتـان دەکـەم کە لەگەڵـم دانیشـتن •
هیوادارم بتوانم بەشداری لە چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانە بکەم‌و
باسی ئەو هەنگاوانەیش بکەم کە دەبنە هۆی پێشکەوتنی هونەرو ئەدەبی
گەلەکەمان ، هیوادارم لەم رێگایەدا دریغی نەکەم •

**نـەژاد :**

بێ‌گومان مامۆستا خالید ! پێشەکی کە خەڵکی تۆیان ناسیبێ وەك
شاعیرێك ناسیویانی ، دیسان دیوانی یەکەمیشت ـ ئاگرو گوڵ ـ کە لە
سەرەتای یاخود بڵێین دوابەدوای ئەو ئەزموونانە چاپکرا کە دوابەدوای
سەرهەڵدانی شیعری نـوێی کوردی هاتنـە بەر رووناکی ، ئەلبەتـە
لەقۆناخێکی دیاریکراودا دەوری خۆی بینی •

ئێستا دەمانەوێ بزانین داخۆ بەینت لەگەڵ شیعر چۆنە ؟ ئایا دوای
( ئاگرو گوڵ ) (١) هیچت بەدەستەوەیەو ، شیعری ئـەمڕۆی کوردی
چۆن دەبینی ؟

**خالیـد :**

ئێستا لەگەڵ شیعر تابڵێی دۆستایەتیمان بەهێزە ، من بوونی خۆم
لەگەڵ شیعر دەبینم‌و لێکیان جیا ناکەوەوە •• ئەگەر بڵێم ( شـیعر منم ) و
منیش شیعرم ! لەوانەیە راستم گوتبێ •

---

(١) ئەوکانە هێشتا مامۆستا « بەرەو لووتکە ئاوات »ی چاپکرد بوو •

ئەمرۆ کە من تێدەفکرم کاك نەژاد زۆر شت لە ژیانی نەتەوەکەمدا دەبینم ( پێویست دەکا شیعریان بۆ بڵێم ) ، بەڵام گیروگرفتی رۆژانەی خۆم‌و ئاڵۆزی ژیان زۆر جار وام لێ‌دەکا سەرنجەکانم لە سنورێکدا بمێننەوە یا دەمێننەوە ، ئنجا دوای ماوەیەك لەگەڵ چەند سەرنجێکی دیکەدا یەك‌دەگرنەوەو شیعرێ لەدایك‌دەبێ ..

پاش ( ئاگرو گوڵ ) کە لە ١٩٧١ دا چاپم کردووە ، هەندێ شیعری‌ترم کۆکردۆتەوە .

**مومتاز :**

مامۆستا لەنێوانی قسەکانتدا باسی ئەوەت کرد کە زۆر دیمەنی ئەوتۆ دەبینی سەرنجت رادەکێشێ‌و ئەو سەرنجانەش کۆدەبنەوەو دەبنە شیعر یا کۆپلە شیعر . ئایا چەند چاوەڕوانی ئەم کۆپلە شیعرانە دەبی تاکو خۆیان دەدەنە دەستەوە .؟

**خالید :**

ئەو سەرنجانەی کە دەکەونە پێش چاوی شاعیر یا چیرۆك‌نووس یا هەر ئینسانێکی هەستیار ، ئەو سەرنجانە جیاوازیان لەگەڵ یەکتری هەیە ، دیسان لە شاعیرێکەوە بۆ یەکێکی‌تر دەگورێ ، سەیر دەکەی هەلوێستێ کار لە شاعیرێ دەکا بەجۆرێك لەلای شاعیرێکی‌تر لەوانەیە بەوجۆرە نەبێ‌و کەمتر جۆش‌بخواو درەنگتر لە بەرهەمێکی‌دا رەنگ‌بداتەوە ، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆسەر ژیانی شاعیرەکە خۆی‌و پێوەندیەکانی بەو سەرنجانەی کە بە هەڵکەوت دێنە بەرچاوی .

**مومتاز :**

مامۆستا وابزانم کە دەڵێین سەرنج واتە هەڵچوونی ناخی شاعیر

بەرابەر ئەو دیمەنانەی دەیانبینێو کاری تێدەکەن ، بەڵام هۆی ئەوە چی‌یە کە لای شاعیرێك ئەو هەڵچوونە زووتر دەبێتە شیعرو لای شاعیرێکی‌تر درەنگتر ، ئایا پێوەندی بە هەلویستو بیروباوەڕەوە هەیە یا بە هەستی ئەو شاعیرەوە ؟ •

**خالید :**

عەرزت دەکەم ، ئینسانو ژیان هەمووی وەکو سەعات وایە ، هەر پارچەیەك لەو سەعاتە کار دەکاتە سەر پارچەکانی‌تر ، واتە ئینسان خۆی لە کۆمەڵە شتێك لەو شتانە پێك‌هاتووە •• ژیانیش هەر بەوجۆرە ، بەم جۆرە هەردوو لایەن پێوەندیان بەیەکەوە هەیە ، جا گەلێ‌جار وا ڕیك‌دەکەوێ کە ئەو پێوەندی‌یە ( سلبی ) دەبێو گەلێ جاریش بەپێچەوانەوە •

بەم‌چەشنەو لە ژیانی ڕۆژانەدا گەلێ باری سەرنج دێنە بەرچاوی ئینسانی شاعیر ، کە ئەمەش لە سەرەنجامدا شیعر دروست‌دەکا جا زوو یا درەنگ • ئەمەیش پێوەندی‌بە خودی شاعیرەوە هەیەو لە رادەی ڕۆشنبیری‌و رووناك‌بیری شاعیر جیاناکرێتەوە ، هەروابێتەوە زەوق‌و چێژو ئاوات‌و خواستی شاعیر •

**مومتاز :**

مامۆستا کەواتە با سنووری چوار چێوەی قسەکانمان فراوانتر بکەین ، رات دەربارەی ئەدەبیاتی ئێستای کوردی چی‌یە لە شیعرو ئەو بابەتە ئەدەبیانەی کە ئێستا لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاو دەبنەوە •• بەپێی ئاگاداریتان چۆنی دەبینن ؟

**خالیـد :**

لەراستی‌دا ئەمن بۆ شایی‌یێکی گەورە دەبینم ..

گەلەکەمان لەساڵی (٩٦١)ەوە تووشی زروفێکی پڕ گۆڕانـکاری بوو . ئەم زروفە وای کرد کە ئەدەبو هونەرمان تارادەیەك خـەوتو ئەوگورجو گۆڵی‌یەش کە لە حەفتاکانەوە هاتەوە بەری نەبـوو ... ئەو ماوە دوور درێژەیش لاوەکانمان بـە ئـەدەبو هونـەری کـوردی پەروەردە نەکران ، تاکو ببێتە هۆی ئەوەی جموجووڵێـك دروسـت ببێ ، دەتوانم بڵێم تا رادەیەك تووشی جۆرە وەستانێکیش بوو ، ئەوەش بۆشایی‌یێکی زۆری دروست‌کردو نزیکەی تا (١٠) ساڵـی خایانـد ، شاعیرانی پێش ئەو ماوەیەش ، ئەوانیش تاقەتـی ئەوەیان نەمابـوو .. ئەمەش‌وا رۆیی تاکو دوای ساڵانی حەفتا . ئەوانەی کە لەو ماوەیەش هاتنەروو پێوەندیکی بەهێزیان نە لەگەڵ ئەوانەی پێش خۆیانو نـە لەگەڵ واقیعی گەلەکەمان نەبوو زوربەشیان هـەڵچوون ، بـەڵام نـەك لەسەر بناغەو ئەساسێکی پتەو ، ئەوەبوو وتم کە پێوەندیان بە ئەوانی پێش خۆیان ئەوەندە پتەو نەبوو و بێجگە لەوەیـش زوربەیـان گەنـجو خوێن‌گەرم بوونو حەزیان دەکرد زووتـر دەرکەونو لەسەر کورسی شاهانەی شاعێریتی دابنیشنو جەماوەر دەورەیان بداو نرخیان لێ بنێ ، ئیتر شیعری کۆنیان ڕەفز کردەوەو گۆیا ئەوەی کۆن زەمانی نـەماوەو بەسەرچووە وئەبێ ئێمە شیعری تازەو وشەی تازە بڵێین .

من خۆم لەگەڵ ئەو مەسەلەی گۆڕانەدام کە ئەدەبیش نوێشـکی ئەو ژیانەیە ، بەڵام پێویستە پێوەندیشی لەگەڵ پێش خۆی نەپچڕێنێ .

هەموو شتێکی تازە لە بناغەیەکەوەیە ، نەمامی تازە ڕواو کۆرپەی دارێکی پیرە ، جا ئەو برادەرانە لەو مەسەلەیدا بەسەهو چووبوون .

زیاد لە پێویست هەڵچوون‌و کەف‌و کوڵێکی زۆریان فرێدا ، دەیانگووت ئەبێ ئەدەبێ ئەمرۆ پێوەندی بە هی کۆنەوە نەبێ ، حاجی قادرو نالی‌و سالم‌و حەمدیی ساحیب قەران‌و فەقێ‌تەیران‌و خانی هەموو رەفز کرابوونەوە •• بە ڕای من دەبێ شیعری ئەمڕۆ شیعرێکی زیندوو بێ خزمەتی ژیان‌و ئەو مەسەلانە بکا کە خەڵکی کوردستان دەیانەوێ •• خزمەتی بیروباوەڕی پێش‌کەوتووانە بکاو پێویستە چەکی خەباتی گەل بێ‌و لە هەمان کاتدا گەل بکاتە چەکی خەباتی خۆی‌و بە زمانی ئەوان بنوسرێ‌و خەڵکی تێی‌بگات ، چونکە ئەگەر تێی‌نەگا ئەو خەڵکە چۆن بیکاتە چەکی گەل ، شیعری ئەمرۆ دەبێ کوڕی چەرخی بیستەم بێ •

**نەژاد :**

راستی من تاقییێکم لەسەر قسەی مامۆستا هەیە ••

جارێ مەسەلەی ئەو نوێ‌یەی باسی دەکا کە رەفزی کۆن بکرێتەوە ، وادەزانم ئەو شاعیرانەی کە لەوەدا بەسەهوو چوون ، هەر لە ئەزەلەوە لەبارچوون‌و نەهاتنە سەر دونیایێ •• بەڵام ئەوە مانای ئەوەش نی‌یە کە ئیتر ئەوەی لەسەر رێبازی کۆن نەڕوا ناتوانێ شت‌بدا بەدەستەوەو وەکو مامۆستا واتەنی خزمەتی مەسەلەکانی ژیان بکا •• بۆچی ؟ من شیعری تازەی کوردی لەم بارەیەوە دەستەوەستان نابینم ، پاشان مەسەلەی تێگەیشتن‌و تێ نەگەیشتنیش بەو جۆرە نی‌یە کە وەکو تاوانێك هەمیشە دەدرێتە پاڵ شیعری نوێی کوردی •• لەگەڵ ئەوەشدا من لەگەڵ مامۆستادام لە هەندێ مەسەلەدا •• من دەڵێم نەك هەر شیعری کوردی بەڵکو شیعری عەرەبیش کە زروفێکی دیکەی هەیە • هەر تووشی پاشاگەردانی‌یەك بووە ، کە ئەم پاشاگەردانی‌یەش زۆر جاران بە ئاوەژوو لێك‌دەدرێتەوە •

دیسان ماموستا موشکیلەیەك هەیە ئەمرۆکە نەك هەر لەناو کورد بەڵکو لەناو زۆربەی میللەتان ئەویش مەسەلەی ( لوتکە )یە ..

ئیستا نووسەرو شاعیری چاك هەیە ناڵێم نی‌یە . بەڵام ( لوتکە ) ئەمرۆکە لە ئەدەبی جیهاندا .. کەمن ! کەم وا ڕێكدەکەوێ نووسەری وەکو ( هەمینگوای‌و دیستۆفسکی‌و بەلزاك ) و شاعیری وەك (مایکۆفسکی‌و رامبۆو پوشکین ) بەرچاو بکەوێ ..

دوای ئەوەش مەسەلەی نوێکردنەوە . من هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم ( تەجاوزی ) گۆران نەکرابێ بەڵام داخۆ ئەوانەی کە ئەم کارەیان ئەنجام داوە کەسیان لوتکەن ؟ ئەمەش بۆیە دەڵێم چونکە ( گۆران ) لە قۆناخی خۆی‌دا بە رای من لوتکە بوو وەکو ئەوەی کە شاعیرێکی وەك ( پۆشکین )یش لوتکە بوو .. ( لەگەڵ بارو زرووف‌و قۆناخی هەردووکیشیان ) .

دیسان لە نوێخوازی‌دا هەمیشە گڕو جۆشێك هەیەو بە کەف‌و کوڵێکەوە سەرهەڵدەدا کە زۆرجاران دەبینی ( ئیستیعاب ) ناکرێ بەتایبەتیش لەلای ئەوانەی کە خویان بە قاڵبی دیارکراوەوە راهێناوە . بۆیە دەبینین بەرامبەری دەوەستن‌و هەزارو یەك برویانوویشیان بەدەستەوەیە .

من پێم‌وایە سەرهەڵدانی روانگە لە کات‌و زروفی خۆی‌دا بووو دەشبوایە سەرهەڵبدا ، لەگەڵ ئەو سەرچیخ چوونەشیان بەرابەر زۆر لە مەسەلەکانی نوێکردنەوە ... بەڵام جورئەتێکی چاکی تێدابوو ، دوای ئەوەش بوو بە هۆی سەرهەڵدانی بناغۆکەیەکی رەخنەی کوردی ، بەم‌جۆرە وەکو دەڵێن ( تەحسیلی حاسڵ ) ئەدەبەکەمانی بۆ پێشەوە برد . کە ئەمەش سوودی هەبوو زەرەری نەبوو ، ئەوەتا بەم‌جۆرە کە دەبینین

ئێستاکە ئەو کەف‌وکوڵە نەماو مەسەلەکە بە لایێکی‌دیکەدا شکایەوە ••

بە هەرحاڵ مامۆستا ئێمە دەمانەوێ رای تۆش دەربارەی ئەم مەسەلانە بزانین‌و بزانین داخۆ ڕای تۆ لەبارەی ئەو بەجێهێشتن‌و هەندێ مەسەلەی کە پێوەندی بە کەلەپوورەوە هەیە چی‌یە ؟

**خالید :**

ئەوەی راستی بێ ( گۆران ) لە پەنجاکان‌و ساڵانی شەست‌و ئەو دەوروبەرە لوتکەی شیعری کوردی بوو بەڵام هەروەك دەزانین شیعرەکانی گۆران بەشی زۆری وەسفی بوو بە شێوەیەك خەڵك تێی‌ناگا ، وابزانم گۆران وەسفی‌وای نی‌یە خەلك تێی بگات ! •••

**نەژاد :**

بەڵام مامۆستا لەمەدا لەگەڵت نیم ، جارێ ئەوەڵەن بەشی زۆری شیعرەکانی گۆران بەوچەشنە نەبوون ، پاشان لە مەسەلەی وەسفیشدا من گۆران ئەوەندی بە ( غامیز ) نابینم ••

گۆران کە دەڵێ :

کۆمەڵە شاخێ سەخت‌و گەردن‌کەش
ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش

ئیتر نازانم کێ لەم وەسفە ناگا ؟ ، یاخود گەشتەکەی هەورامان ، دەزانی مامۆستا ! من ڕایەکی دیکەم هەیە • من وای‌دەبینم لە هەموو شیعرە وەسفیەکانی گۆراندا وادەردەکەوێ کە شاعیر هەوڵدەدا ئینسانی کورد زیاتر بە خاکەکەیەوە ببەستێتەوە •• بێجگە لەوەیش کە بیانی‌یەك بیخوێنێتەوە باوەکو نەیشی‌دیبێ وڵاتی گۆرانی دەکەوێتە بەردڵ‌و

خۆشی‌دەوێ ، ئەلبەتە مەسەلەی تەجروبەی شیعریشی لەولاوە بوەستێ .

**خالیـد :**

عەرزم‌کردن کە کورد لە ژیانی‌دا ئالۆز بووەو زۆر لایەن هەبووە کە پێویستی بە دەیەها چیرۆك‌و شیعرو گۆرانی بووە . ئەمەش بە وەسف حەقی خۆی نادرێتێ .

جا ئێستا من هەر قسەکەی خۆم ئەکەمەوەو ئـەڵێم ، شـیعرەکانی گۆران بەشی زۆری وەسفن‌و وەسفیش ناتوانێ هەموو لایەنەکانی ژیان داپۆشێ‌و هەموو گیروگرفتەکانی ژیان پەروەردە بکا .. گۆران دەوری هەبوو لەوەی کە کوردستان بە خەڵك بناسـێنێ‌و دەورێـکی زۆریشـی لەمەسەلەی زمان‌و زاراوو چێژو کامەوە هەبوو ...

من دەشڵێم کە پێویستە گۆران جێ‌بهێڵرێ ، کە جێشـی دەهێڵین نابێ بخرێتە پشت‌گوێ ، ئەبێ هەیکەلێکی پیرۆزی بۆ بکەین ، چونکـە هەرکەسێ قارەمانی زەمانی خۆیەتی ، ئەوەش شـتێکی ئاسـاییە کـە گۆرانی پەنجاکان ناتوانێ ببێتە گۆرانی حەفتـاکان . وەکـو خۆیشـت ئەیزانی کە گۆران قارەمانی شیعری عاتیفی بوو ئەمرۆ ناتـوانێ وەکـو پێشمان بێتەوە مەیدان . بەنیسبەت حاجی قادریش هەروا ، جا ئیتر هـەر کەسێ قارەمانی زەمانی خۆیەتی . گوران هات‌و دەوری خۆی دی ، ئەبێ جێ‌ی‌بێڵین‌و ریزیشی لێ بنێین کە بزانین ئەوە گۆرانی قارەمانەو دەوری خۆی دیوە .

من ئەوەش ئەڵێم ئەگەر شـایەد گۆران دە دوانزە سـاڵی‌تریشـ بژیابووایە، زیاتر ئەهاتە ناو شیعری کوردی‌یەوەو لە وەزعی کۆمەلایەتیمان نزیکتر دەبووەوە کە ئەمەش یەکێك بووە لە سیماکانی شیعری گۆران

دوای شۆرشی (٥٨) • زۆرم خەم بوو کە بەداخەوە گۆران پێش وادە کوچی یەکجاری لێ نا ، بێ ئەوەی کە ئەم ڕێگایە پتەو بکا •

**نەژاد :**

ماموستا من گۆران بەوجۆرەش نابینم •• لەوانەیە وەکو فەرمووت گۆران زیاتر لە شیعری عاتیفی یەوە نزیك بووبێتەوە ، بەڵام من تێناگام داخۆ شیعر هەیە بەدەر لە عاتیفە ••

بە هەرحال ، من هەر ئەوەندە دەڵێم خۆزگە هەموو شاعیرانمان وەکو گۆران قارەمانی زەمانی خۆیان دەبوون •••

**مومتاز :**

ئەمنیش با تاقیێکی چکۆلانە بۆ مەسەلەکە بکەم •• وەك دەڵێی کە درێژەی پێنەدەین دبارە کە لەسەر سەفەرن ••

بەلای منەوە گۆران کۆمەڵە لوتکەیەکە ، بووە بە لوتکەیەکی گەورە ، تائێستا ئێمە نەمانتوانیوە بەچاکی لە گۆران بگەین و پەیرەوی گۆران بکەین ، ئەڵبەتە پەیرەوی ڕێبازی گۆران لە هەموو مەیدانێکدا •

با ئەوەندە بەس بێ • ئێستا با بێینە سەر مەسەلەی ئافرەت لە شیعردا ، ئافرەت لە کۆمەڵدا • ؟

**خالید :**

ئافرەت کە نیوەی کۆمەڵە بێ پیاو نازی ، پیاویش هەربەو جورە بێ ئافرەت نازی کەواتە هەردوکیان تەواوکەری یەکترن ، بۆیە پێویستە ئێمە ئەم ڕاستی یە بە کردەوە بسەلمێنین • بەگوێرەی شیعری کوردی ئافرەت بزوێنێکی زۆر ئەساسی بووە بۆیە هەرگیز نەتوانراوە کە ئەم

هەقیقەتە بخرێتە پشت گوێ تەنانەت لە لایەکانی تری ژیانیشدا ، هونەر، ئابووری • کۆمەلایەتی • ، من لەوباوەڕەدام کە ئەو پاشاگەردانی‌یەی دووچاری ئافرەتی کورد بووە هەمووی لەئەنجامی ڕەفتاری پیاوەوە بووە • ئەوە بێجگە لە هۆی‌تریش وەکو نەخوێندەواری‌و تێکەلاوبوونی ژیانی شارستانێتی ، بەوجۆرەی کە بووە •

**نـەژاد :**

مامۆستا بائێستا بێینە سەر مەسەلەی ئاوازو گۆرانی کوردی ، دەلێم داخۆ ئێوە ئاوازو گۆرانی کوردی لە حالی حازری‌دا چۆن دەبینن‌و ئاسۆی دوارۆژی بە رای ئێوە چۆن دەبێ ؟

**خالیـد :**

ئاوازو گۆرانی کوردی ئەمڕۆ بە قۆناغێکی تایبەتی‌دا دەڕوا بەتایبەتیش گۆرانی عاتیفی •

ئەمڕۆ گۆرانی عاتیفی بواری خۆنواندنی زیاترە لە گۆرانی سیاسی ئەگەر گۆرانی کوردی یا ئەوانەی کە ئەم هونەرەیان لەئەستۆیە دەبێ پێویستیەکانی گەنج‌و یاخود نەوەی ئەمرۆ بزانن‌و دەری‌بڕن بەم جۆرە پێشکەوتن دەبێ‌و تام‌و چێژی گۆرانی کوردی لە دەست ناچێ •

دیسان لایەنێکی زۆر گرنگ هەیە کە دەبێ لە بەرچاوبگیرێ ، ئەویش ئەوەیە کە بیانی‌یەك گوێ‌ی لە گۆرانی کوردی دەبێ یەکسەر بزانێ کە هی گەلێکی تایبەتی‌یەو ئەم گەلەش گۆرانی‌و ئاوازی تایبەتی خۆی هەیە بەمجۆرە ئەبێ هەولەکانمان بۆ ئەم مەبەستە لەپێناوی ئاوازو گۆرانی ڕەسەنی کوردی بێت بۆئەوەی ئەم پێویستی‌یانەی کە نەوەی نوێ بەسەر رۆژگاری‌دا سەپاندوە بهێنرێتەدی •

من نالێم فۆلکلۆری کوردی دەوڵەمەند نیە، ئەڵبەتە کە ئەمە بەڵگەی ناوێ چ لە ئاوازو چ لە شیعر ، بەڵام نابێ ئەوەیشمان لەبیرچێ کە ئەم ئاوازو شیعرە هی قوناغی خۆی بوو ، ئێمە پێویستیمان بە گۆڕین هەیە گۆڕینیش بە ڕای من تەنها ئەوە نیە فۆلکلۆرەکە بێنین‌و بەگەڵ ئاوازی هۆرمۆنی‌و ئالەتە ڕۆژاواییەکان لە تێکەڵاویەکی یەك نەگرتوودا کۆیان‌بکەینەوە• دوای ئەوەیش ئێمە بۆ هەر فۆلکلور بڵێینەوەو بەس ؟ بۆ ئاوازی تازەمان نەبێ ؟

ئێمە تا ئەوساڵیش هەر لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆیشتووین بەداخەوە دەڵێم کە گورج‌و گۆلیمان هەر لەو ڕوانگەو ڕێیەوەیە ، تاوێکمان بۆ ئەو گۆرانیە تازانە تەرخان نەکردوە کە پێویستیمان پێی هەیە •

ئەمرۆ ئەبێ شاعیرمان هەبێ شیعری گۆرانی بلێ‌و بەس • ئەبێ کۆمەڵی لاوو گەنجی خوێن‌گەرممان هەبێ کە بەتەنگ ئیشەکەوە بێن ( ئەڵبەتە لەگەڵ شانازیمان بۆ ئەو گەنجانەی لە تیپەکانی کوردستان‌دا کار دەکەن ) بەم‌جۆرە ئاوازو گۆرانیمان بەرەوپێش دەچێ چونکە جۆرە مل‌ملانێیەکی پیرۆز لەنێو شاعیرو ئاواز دانەرەکان‌دا دروست‌دەکاو لەئاکامیشدا خۆشترین شیعرو ئاوازی لێ دروست دەبێ• بەڵام بەداخەوە تەماشا دەکەی یەکێك تۆزێ مۆسیقا دەزانێ یەکسەر ئاوازێك ، دائەنێ ، لەدوایش‌دا هەڵدەستێ هەر خۆیشی شیعرێکی دەقەبەر دەکاو مۆسیقاکەشی لێ‌دەدا • ئیتر کورد واتەنی دوو سێ گندۆران بە دەستێکی هەڵدەگرێ •

ئەم جۆرە گۆرانیانە بەسەر خەڵکیشدا فەرز دەکرێ بەوەی کە لەهۆیەکانی بڵاوکردنەوەدا لە رادیۆو تەلەفزیۆن پیشادەدرێ‌و بێ‌ئەوەی بیر لە ئیعتیباراتی هونەری بکرێتەوە تۆمار دەکرێ ئیتر بە دوو ڕۆژان

کابرا دەبێتە هونەرمەند بەســەر ســەری خەڵك • من ئــەم دیاردە بــە گیروگرفتێکی گەورەی هونەری کوردی ئەمڕۆ دەبینم •

**نــەژاد :**

دیسان مامۆستا گۆرانی‌یەك کە بەمجۆرە لەدایــك‌دەبێ بێ‌گومــان کارێکی تەواویش دەکاتە سەر زەوقی مــرۆڤ‌و لەباتــی پەرەپێدانی ، دەیمرێنێ •• بەمجۆرە ئەو هونەرمەندەی کە بــەو شێوەیــەی جەنابتان باسی‌کرد دەبێتە هونەرمەند زیانی لە سوودی زیاتر دەبێ •• کورد دەڵێ ( عوزری لە قەباعەت خەراپترە ) •

بێ‌گومان ، ئەو هونەرمەندەی بەناو هونەرمەند هەرگیز ناتوانــێ شتێ بەدەستەوەبدا •

**مومتــاز :**

مامۆستا ( ئەڵبەتە شەرتیش نی‌یە ئەوەی کە من دەیڵێم ڕاست بێ ) بەڵام وەکو ڕا ، من هەست‌دەکەم کە ئێستا گۆرانی عاتیفی بەســـەر هەموو گۆرانی‌یەکدا زاڵە • نازانم جەنابتان راتان بەرابەر ئەم قسەی من چی‌یــــە ؟

لە قسەکانی هەوەڵماندا لەسەر ئەدەب عەزرم کردن ژیــان وەك زنجیرە وایە هەر ئەڵقەیەك لەو زنجیرە شوێنی خۆی هەیە ، گورانیش هەر وایە وەزعێکی تایبەتی جا چ سیاسی بێ یا کۆمەلایەتی کاری تێ‌دەکاو نیشانەیەکی پێوە دەبێ کە هی ئەو قۆناخەیەو هی ئەو سەردەمەیەو مۆرکی ئــەو سەردەمەیشی پێــوە دیــارە • ئەمــڕۆ گۆرانــی عاتیــفی بەسەر

چەشنەکانی‌تری گۆرانی‌دا زاڵە • هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر بارو زروفێکی مەوزوعی ، قوناخێکی تایبەتی •

**نـەژاد :**

مامۆستا پێش ئەوەی پرسیارێ بکەم تێبینی‌یەکی چکۆلانەم هەبوو، ئەویش ویستم بڵێم نەك هەر گۆرانی یا هونەر بەگشتی بەڵـکو هەمـوو لایەنەکانی‌تریش پێوەندیان بە بارو زرووفی ئەو گەلەوە هەیە ، بۆیـە دەڵێم پێویستە ئێمە لە هەر هەڵسەنگاندنێکماندا ئـەو نوختەیـە رەچـاو بکەین •

ئێستا با بێمە سەر پرسیارەکەم • دەڵێم تائیستاکە من لەو بڕوایەدا نیم شیعری نوێی کوردی (بەگشتی) نەبێتە گۆرانی•• بەڵام بەداخەوەم کە زۆربەی ئاوازدانەرەکانمان ئاوازی دانراو دەقەبەری شیعر دەکەن، نەك ئاواز بۆ شیعرەکە دابنێن، بەم‌پێ‌یە ناگەینە ئەو رادەی تێکەلاوبوون‌و توانەوەیان لە یەکتریدا •• من ئەم مەسەلەیە بە ( تەقسیر ) تێ‌دەگەم •• ئێوە چ دەڵێن ؟

**خالیـد :**

ئەمڕۆ ( تەخەسوس )ی هونەری پەیدا نەبووە کە هەندێ گەنجمان هەبێ فێری شیعرو ئاواز بن ئەوساکە شیعر زۆر ئەبێ ئاوازیش زۆر ئەبێ وەکو ووتم پێشبڕکێ‌یەکی پیرۆز پەیدادەبێ‌و شیعرو ئاوازی چاك دەقەبەری یەکتر دەکرێن بەڵام شیعری ئەمـڕۆ کە کەمـتر دەکرێتـە گۆرانی هۆی دەگەڕێتەوە بۆ نەبـوونی سـەروا ( قافیە ) • شیعرێکیش سەروای نەبـێ نەختێ بەزەحمـەت دەکرێتـە گۆرانـی دوای ئەوەیش گۆرانی ئەمڕۆ دەبێ شیعرێکی روون‌و ئاشکرا بێ بۆ ئـەوەی بەتەواوی بچێتە دڵی خەڵکەوە •

**مومتـاز :**

مامۆستا خالید زۆر سوپاسی هەستت دەکەین بۆ ئەم دانیشتنەمـان هیوادارین زۆرجاری‌تریش پێك بگەینەوەو دووبارە سوپاس •••

**خالیـد :**

منیش سوپاسی برایەتیتـان دەکەم‌و هیـوای سەرکەوتنتـان بـۆ دەخوازم ••

---

گێتی شانۆیە ، بەڵام دەورەکانی شانۆکاری‌یەکە خراپ دابەش‌کراون !

**ئۆسکار وایلد**

---

# دوو تاباۆی شیعر بۆ منالآن

**ڕۆستەم باجەلآن**

**١ـ حـەز**

منالّەکان !
ئای حەزدەکەم :
بالّی خوڕەی دەریای ڕەش‌و
سوورو سپی تێکەڵ یەك کەم !
وای حەزدەکەم
وشەی مێشکم
بە لایەنێ پێوەند نەکەم !
بەڵام چبکەم ؟
دڵدارەکەم کۆت‌کرایە •••
ناشزانرێ لەودیو پەردە
چ کزدیتاو چ هەرایە ••

**٢ـ نیشـتمان**

منالّەکان !
کچێکی خوێن‌گەرمی کووبی
خوشکە بچکۆلەکەی لەئامێز گرتبوو

دەیوت : دایە
ئەها •• ئەها ••
دەنگی گرمەی فڕۆکە دێ ••
دەنگی ناپاڵم‌و قازیفەو نارنجۆك دێ ••
دەیوت : دایە •• توخوا دایە
هەر بەتەنها نارنجۆکێ توانای هەیە
خوشکم ـ نەزەند ـ و بووکۆکەم
لەنێو خوێنا بگەوزێنێ ؟
هەر بەتەنها نارنجۆکی توانای هەیە
قوتابخانەکەم بڕمێنێ ؟
ئەویش دەیوت : کچۆڵەکەم
ناحەزەکان
وەك دڕندە هێرش دێنن
سکی مناڵ دەدڕێنن‌و ••
قوتابخانەو دارو خانووش دەسووتێنن
بەدنیهادن
لەنێو خاك‌و نیشتمانمان
دەرمان‌دێنن ••

# هنری باربووس کێیە ؟

محەمەدی مەلا کریم

ماوەیەك لەمەوبێش کاك سەلاح شوان لە گفتوگۆیێکی ئەدەبیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ( العراق ) کە لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٨٢/٨/٣٠ ی ئەو ڕۆژنامەیەدا بڵاوکراوەتەوە ، لە وەڵامی پرسیاری ئەوەدا کە دوا کتێبی عەرەبی چی‌یە خوێندبێتیەوەو چۆنی لێك ئەداتەوە ، وتبووی :

« لەمدوایی‌یەدا بەشی تایبەتیی ڕۆمانم لە کتێبی ( نظریة الادب ) خوێندەوە ، بەڵام تەواوم نەکرد • ڕەنگ‌بێ لەبەرئەوە بووبێ تەواوم نەکرد کە هەندێ بیرو ڕای‌وام تێدا دی لەسەر بنەڕەتی مەعلووماتی کۆن یا ناتەواوی‌وا بیناکرابوو لە بڕیاردانو ئەنجام‌گیریدا تەنها پشت بە گۆشەیەکی تەسك ببەستێ • بۆنموونە ئەم کتێبە ناوی ( هنری باربووس )ی بنووسی ڕۆمانی ( دۆزەخ )ی تا بینەقاقە لە بێهوودەگەری ( العبثیة ) دا چەقیوی وا هێنابوو کە یەکێکە لە بنووسە شەنگەکانی ڕۆمانی ڕیالیستیی سۆشیالیستی لە ڕۆژاوا » •

بەداخەوە کاك سەلاح لەم هەڵسەنگاندنەیدا بۆ باربووس ، بەپێچەوانەی ئەوەی لێی چاوەڕوان ئەکرا ، کە دێ تاوانی ئەوە ئەخاتە ئەستۆی خاوەنانی کتێبی ( نظریة الادب ) گوایە لەسەر بنەڕەتی کۆن یا ناتەواو قسەیان کردووە ، خۆی لەسەر بنەڕەتی مەعلووماتی هەم کۆنیش‌و هەم ناتەواویش قسەی کردووە • لەسەر بنەڕەتی کۆن قسەی کردووە چونکە ( دۆزەخ ) دووهەمین بەرهەمی باربووسەو باربووس

گەلێ بەرهەمی تازەتری هەیە کە بەجۆرێکی تر بیری کردووەتەوە تیایاندا • لەسەر بنەڕەتی ناتەواویش قسەی کردووە ، چونکە سەرانسەری بیری باربووس لە ( دۆزەخ ) یدا نیی‌یە • بیری ناو ( دۆزەخ )ی بیری قۆناغی یەکەمی ژیانیەتی‌و تەواوی بیری یا بیری تەواوی لە بەرهەمەکانی لەوەپاشیدا دەرئەکەوێ •

ئەمە ، ئەمە • بەڵام من تێ‌ناگەم کاك سەلاح ، وەك ڕۆشنبیرێك ، چۆن ڕێگا بە خۆی ئەدا وابزانێ خاوەنانی کتێبی ( نظریة الادب ) ، کە کۆمەڵێکن لە ئەکادیمیکە پسپۆڕی ئەدەبەکانی سۆڤیەت ، ئەوەندەی ئەو شارەزای بەرهەم‌و ژیانی باربووس نین‌و ، لە خۆی ناپرسێ چۆن لەم جیهانە گەورەیەدا درۆی‌وا ئەکرێ باربووس عەبەسی بێ‌و بە زۆری زۆرداری بکرێ بە واقیعیی ئیشتیراکی‌و ، ئەبێ سوودی خوێندەواری سۆڤیەتی لەوەدا چی بێ ڕووی ڕاستی باربووسی ـ ئەگەر ڕاست بێ عەبەسی بێ ـ لە عەبەسی‌یەتی‌یەوە لەپێشدا بکرێ بە واقیعی ؟ ئاخۆ بەوە بەڕاستی ئەبێ بە واقیعی‌و یەکێك لەوانە زیاد ئەکا کە باوەڕیان بەو ڕێبازە ئەدەبی‌یەیە سۆڤیەت لەسەری ئەروا ؟

ئەنجا گریمان ڕاستە هنری باربووس عەبەسی بووەو ، خاوەنانی کتێبی ( نظریة الادب ) بەدرۆ کردوویانە بە واقیعی ، بەڵام کاك سەلاح چ‌زیانێکی تووش ئەبوو ئەگەر کتێبەکەی هەموو بخوێندایەتەوەو هەندێ درۆی دووزەردێنەی‌تری لەم‌چەشنەشی تێدا بدۆزیایەتەوە ؟ لام‌وایە ئەوە شتی چاك ئەبوو بۆ ئەوکەسانەی هەر ئەوەندە کوێرە ڕەخنەیەکیان دەسگیر ببێ لە بەرەی دۆستانی واقیعیەتی ئیشتیراکیی بگرن ، وائەزانن هەنگیان لە داردا دۆزیوەتەوە ! ئەوانەی دژی واقیعیی ئیشتیراکین ، واقیعی‌یە ئیشتیراکی‌یەکان بەوەتاوانبار ئەکەن کە ئەوەندە ئاسۆ تەسك‌و دەروێش مەشرەبن لە جزمی بیروباوەڕی خۆیان بەولاوە

چاویان بەرایی نادا تەماشای کتێبێك بکەن ، کەچی وا کاك سەلاحیش هەر لەداخی ئەوە کە لە ( نظرية الادب )دا نووسراوە هنری باربووس واقیعیی ئیشتیراکی‌یە ، کتێبەکە تووڕئەداو تاقەتی نامێنێ تەنانەت تەنها بەشی ڕۆمانەکەشی تەواو بکا • بەڵام مەسەلەکە نە لە دەستی مندایەو نە لە دەستی کاك سەلاحداو ، هنری باربووس واقیعیی ئیشتیراکی بووەو هەر لەسەر ئایینی واقیعیەتی ئیشتیراکی‌یش مردووەو ، ئەمەش پوختەیەکی باسی مێژووی ژیانو هەڵسووڕانی ، وەك لە بەرگی یەکەمی « کورتەی ئەنتسیکلۆ پێدیای ئەدەبیی سۆڤیەتی » دا نووسراوە :

★ ★ ★

هنری باربووس ( ١٨٧٣ - ١٩٣٥ ) بنووسێکی فەرەنسەیی‌و شەخسیەتێکی کۆمەڵایەتی‌یە • لە ساڵی ١٩٢٣ وە ئەندامی پارتیی کۆمونیستی فەرەنسە بووە • لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی سۆربۆن خوێندوویەو لە ١٨٩٢ دا داکۆکیی لە دوکتۆرانامەکەی کردووە لە مەیدانی فەلسەفەدا • لە ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدەوە دەستی داوەتە نووسین • لە سەردەمی کۆنەپەرستیی سیاسیی فەرەنسەدا کۆمەڵە چەکامەیەکی بڵاو کردەوە لیپ بوون لە ڕەش‌بینی‌یەکی خەست‌وخۆڵ• لەم کۆمەڵە چەکامەیەدا جێ‌پەنجەی دیکادانسیزم دیارە کە ڕێبازێکی فەردی‌یە ورەبەردان‌و ڕووخانی شەخسی‌و تێك‌شکانی هونەر ئەگەیەنێ، بەڵام هەندێ نیشانەی بێزاری دەربڕینیشی تێدایە • باربووس لە شاکارەکانی ئەمیل زۆلایش کۆڵیوەتەوە • بەهۆی هێزی ڕۆمانەکانیەوەو بەهۆی هەڵوێستیەوە لە مەسەلەی ( دریفۆس ) کە ئەفسەرێك بووە بە ناهەق گیراوە - زۆری خۆش‌ویستووە • لە ١٩٠٨دا ڕۆمانی ( دۆزەخ )ی دەرکردووە کە ڕەگەزەکانی قوتابخانەی سروشتی ( کە

قوتابخانەیەکە لە قوتابخانەی ڕیالیستی‌یەوە زور نزیکە ) جمەیان تێدا دێ • ئەم ڕۆمانە ، بە هەر ڕەنگێ ، نیشانەی وردە وردە گواستنەوەی باربووسە لە هێماکاری‌یەوە بۆ ڕیالیزم • ئەم وردە وردە گواستنەوەیە لە چیرۆکی ( ئێمە ) شدا دیارە کە لە ١٩١٤ دا دەری کردووە •

ئەو ڕووداوەی ژیانی باربووسی بە باری یەکجاریدا خست ، شەڕە ئیمپریالیستی‌یەکەی ١٩١٤ – ١٩١٨ بوو • باربووس وەك سەربازێکی سادەی داوتەڵەب لەم شەڕەدا بەشداریی کرد • نامەکانی کە لە بەرەی جەنگەوە بۆ ژنەکەیی ناردوون ، وەك بەڵگە وانە • باربووس لەم نامانەدا سەرپۆشی ڕۆمانسی‌یانەی سەر ڕووی جەنگی دادڕیوەو پەردەی لە ڕووی سەرکردەکانی فەرەنسە هەڵداوەتەوە • بەڵام لە هەمان‌کاندا قارەمانەتیی گەلیشی لەم شەڕەدا بەدی‌کردووە • لە هەندێ لەو نامانەدا بەراوردی لەنێوان ئەوانەدا کردووە کە هەر بۆ تەماشاو هەواڵزانین ئەچنە بەرەی شەڕەوە لەگەڵ ئەو ڕەنجکێشانەی هەموو ئەرکی جەنگیان بەسەر شانەوەیە • باربووس پاشان بابەتی ئەم نامانەی خستووەتە ناو کتێبی ( ئاگر ) ەوە کە پێشان لە سەنگەردا نووسیوەو دوایی لە ڕۆژنامەکانی پاریسدا بڵاوی‌کردووەتەوەو سەرەنجامیش هەمووی پێکەوە لەچاپ‌داوەو ، هۆی ڕاستەقینەی شەڕی تێدا ڕوون کردووەتەوەو بێزاریی خۆی لەوانە تێدا دەربڕیوە کە ئەبن بەهۆی شەڕو ، باسی ئەوەشی تێدا کردووە چۆن وردە وردە سەرباز هوشیار ئەبنەوەو لە دواڕۆژدا ئەبن بە بنەمای بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی • باربووس لە باسی شەڕدا خۆی لە درۆو ساختەو شتی دەست‌هەڵبەست دوور گرتەوە • ئەو لەم کتێبەیدا ڕەشبین نی‌یە وەك لە ( دۆزەخ ) ەکەیدا ڕەشبین بوو • بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی‌یەوە لەبارەی هاوتیپەکانیەوە ئەنووسێ‌و ئەو هەستەی دەروونی جەنگاوەرەکان دەرئەبڕێ کە بە قووڵی

لەبارەی کورۆکی شەڕو دواڕۆژی پاش شەڕەوە بیر ئەکەنەوە • باربووس زۆر سەرکەوتووانە توانیویە باسی میزاجیدەروونیی سەربازەکان بکا • شتی نوێ لـەم کارەی باربووسـدا لێکـدانـەوەی دەروونیی سـەربازە ساویلکەکانە کە لەگەڵ سیفەتە مێژوویییەکانیاندا تێکەڵ بووە • وەنەبێ دەوری جەماوەریشـ لەم کـارەی باربووسـدا دیار نەبێ • باربووسـ لـەم ڕۆمانـەیـدا مـۆنۆلـۆژی نـاوخـۆی کردووە بـە هۆیـەك بۆ دەربڕینی بیری هەموان کە خۆیشییەکێکیانە • لە کتێبێکی کەشـیدا کە لە ١٩١٩ دا دایناوەو ناوی لێناوە ( ڕوونی ) باسی ئەوەی کردووە کە چۆن زۆر لەم جەنگاوەرانە پاشان شـۆڕشگێڕیان لێ دەرچووە • ڤ• أ• لینین لەبارەی ئەم کتێبەی باربووسەوە نووسیویە : « گۆڕانی بیری کاڵی بنیادەمی عادەتی بە بیری بنیادەمی شۆڕشگێڕ ، دەق ، لەئەنجامی شەڕەوە بوو • باربووس لەم ڕۆمانەیدا ئەممەمان توند ئەخاتە پێش چاو » •

باربووس کە لە شەڕ گەڕایەوە چالاکییەکی زۆری بۆ یەکخستنی ڕۆشنبیرە دژ بە گیانی میلیتاریزمەکان نواند • بوو بە سەرۆکی کۆمەڵی کۆنە جەنگاوەرەکانو لە ١٩١٩ دا کۆمەلەیەکی ئەنتـەرناسیۆنالیسـتیی پێکەوەنا • ئـەم کۆمەڵە دەورێـکی گەورەی لەدژی دەسـتتێوەردانی بێگانە لە ڕووسیای سۆڤیەتیدا گێڕا •

باربووس بەگەرم بەپێشوازیی شۆڕشی ئۆکتۆبـەرەوە چـوو کـە دەورێکی گەورەی لە ژیانو شاکارنووسینی ئەویشدا گێڕا • لە ١٩١٩دا کتێبێکی لەبارەی ئەم شۆڕشەوە نووسی ناوی لێ نا « تیشکێك لە قووڵاییی بنەوە » • چەند وتارێکشیی نووسـی داوای زێروزەبەر کردنی کۆشکی سەرمایەداری تێیاندا کرد • لە ١٩٢٠ دا ئـەم وتارانـە کۆکرانـەوەو هەموویان کران بـە کتێبێك بـە ناوی « وشـەکانی جەنگاورەێك » • لە

١٩٢٥ یشدا ڕۆمانی « کۆتەکان » ی بڵاوکردەوە • باربووس لەم کارە هونەرییەیدا مێژووی جیهانمان وەك زنجیرەیەکی نەبڕاوەی دەردو ئازاری جەماوەری گەلو خەباتی مرۆڤایەتی بۆ ئازادیو بەختەوەری ئەخاتە بەرچاو • لە ١٩٢٦ یشدا کتێبی « خوێنڕێژەکان »ی بڵاوکردەوە• لەم کتێبەدا باسی ئەوە ئەکا حوکمڕانە فاشیستەکانی بولگاریاو ڕۆمانیا چۆن حوکمڕانییان ئەکردو ، لە ١٩٢٩ یشدا کۆمەڵە چیرۆکێکی تری بڵاو کردەوە •

باربووس لە مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبییشدا کاری کردووە • لە ١٩٣٢ دا کتێبێکی بە ناوونیشانی « زۆلا » وە بڵاو کردەوە • ئەم کتێبە بە ڕوون کەرەوەی بیروباوەڕی ئیستاتیکاییی باربووس دائەنرێو ئەوەی تێدا ڕوونکردووەتەوە کە بنەڕەتی هونەری نوێ ئەوەیە ئەدیب پێوەندی بە جەماوەرو گەلەوە هەبێ •

باربووس شاکارەکانی گۆرکیی زۆر بەرز هەڵسەنگاندووە • لەبارەی گۆرکییەوە نووسیویە : « ڕێگای نوێی بۆ جیهان ڕوون کردەوە » لە یەکەمین کۆنگرەی بنووسانی سۆڤیەتیشدا بەشداریی کردووەو وتارێکی تێدا داوە لەبارەی ڕیالیزمی سۆشیالیستیو لەبارەی خەباتەوە بۆ دروستکردنەوەی جیهان لەسەر بنەڕەتی سۆشیالیزمو لەپێناوی ئادەمیزادێکی بەختەوەری ئەوتۆدا کە خۆی گەورەی ژیان بێو لەپێناوی هوشیاریی شۆڕشگێڕانەی گەلدا • ئەمە بنەڕەتی شاکارنووسیی باربووسە •

لە ١٩٣٥ یشدا کۆنگرەی ئەدیبانی جیهان بە ناوی ( نەتەوەو کولتوور ) ەوە بەسرا بۆ داکۆکیکردن لە کولتوور • باربووس بەشداریی لەم کۆنگرەیەدا کردو ئەوەی تێدا دووپات کردەوە کە

کولتووری هەر وڵاتێ لەسەر بناغەی ڕابوردووی کولتووریی نەتەوەی ئەو وڵاتـە دائـەمـەزرێ‌و لە هـەمان‌کاتیشدا بەشـێکە لە کەلەپـووری کولتووریی هەموو مرۆڤایەتی‌و ، تاقی‌کردنـەوەی یەکێتیی سـۆڤیەت‌و گەشەکردنی کولتووری گەلەکانی ئەم وڵاتەو یەکێتیی هارمۆنی‌یانی کرد بە بەڵگە بۆ قسەکانی •

بەم‌چەشنە باربووسـ تا مـرد لەتەقـەلادا بـوو بۆ ڕێکخسـتن‌و یەکخستنی هەمـوو هێزە شۆڕشگێـڕەکانی جیهـان لە خەباتـدا لەدژی فاشـیزم* •

---

★ ئە• ئە• ئایسباخ ئەم باسەی بۆ ئەنتسیکلۆپیـدیاکە نووسـیوەو ، برادەرێك بۆی وەرگێڕام — م• م• ك•

## پێرست

★ ★ ★

---

**لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدا**
**ژمارە ( ٢٤ ) ی ساڵی ١٩٨٢ ی دراوەتێ**

# « الكاتب الكردي »

مجلة « نووسەری کورد »

## مجلة اتحاد الادباء الاكراد في العراق

العـدد (٩) ، الدورة الثانيـة ، تشرين الثاني ١٩٨٢

رئيس التحريـر

الدكتـور عزالدين مصطفى رسـول

سكرتـير التحرير

ممتـاز الحيدري

الادارة

بغـداد ـ الوزيريـة

مقـابل كلية التربية الرياضيـة ـ مقر جمعية الثقافة الكردية

# THE KURDISH WRITER

BULLETIN OF
THE UNION OF THE KURDISH WRITERS IN IRAQ

No. ( 9 ) Second Period, November 1982

EDITOR - IN - CHIEF :
Proffesor - Ds. C. : IZZADIN MUSTAFA RASOOL

DEPUTY EDITOR - IN - CHIEF :
MUMTAZ HAYDARI

Office : BAGHDAD, WAZEERIYYAH, OPPOSITE COLLEGE OF PHYSICAL EDUCATION, HEADQUARTERS OF THE KURDISH CULTURAL SOCIETY.